


# هۆكارەكانی ڕاكردنی مێرد منداڵان لە خێزانەوە بۆ سەرجادە









ئامادەكردنی

توێژەری دەروونی
بێستون محمد عبدالرحمن

توێژەری دەروونی
تەها حسێن والی

ساڵی ٢٠٠٦م بەرامبەر ٢٧٠٦كوردی

# هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان

# لە خێزانەوە بۆ سەرجادە

ئامادەکردنی


توێژەری دەروونی

بێستون محمد عبد الرحمن

توێژەری دەروونی

تەها حسێن والی


ساڵی ٢٠٠٦م بەرامبەر ٢٧٠٦کوردی

## لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و بڵاوكردنەوەی چوارچرا


- پێناسی كتێب
- ناوی كتێب: هۆكارەكانی ڕاكردنی مێرد منداڵان لەخێزانەوە بۆ سەر جادە
- بابەت: توێژینەوە
- ئامادەكردنی: بێستون محمد عبد الرحمن
  تەها حسێن والی
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەكەم / ٢٠٠٦
- شوێنی چاپ / چاپەمەنی چوارچرا ـ
- ژمارەی سپاردن: (٦٢) ی ساڵی ٢٠٠٦ز

# پێشکەشە

- بەو کەسانەی بەدڵسۆزیەوە لەپێناوی چاککردنی گوزەرانی منداڵدا هەوڵ دەدەن و کاردەکەن.
- بەو کارمەندانەی کەلەرێکخراوە ناوخۆییو بیانیەکاندا بەدوای کێشەکانی منداڵدا دەچن و هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەن.
- بەو دایك و باوکانەی کەشەو نوخونی دەکەن لەپێناوی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بەشێوەیەکی زانستی وپەروەردەیی دروست .
- بەهەموو هاورێکانمان.

## پوختەی توێژینەوەکە

### گرنگی توێژینەوەکە

منداڵ جوانی وپێکەنینی ژیانە وئاراستەی سەرەکی بنیات نانی شارستانێتی و کەسێتی مروڤە وەبنیاتنەری داهاتوی کۆمەڵە، ئەم بنیات نانەش بەستراوە بەباروذۆخی پەروەردەیی و دەروونی یەوە، هەربۆیەزۆربەی زانایان و توێژەرەوان لەتوێژینەوەو باسەکانیان دا جەخت دەکەنە سەر قۆناغەکانی منداڵی بەهەموو گۆڕانکاری و کێشەو پێداویستیەکانیانەوە. تابتوانن ئاگارو هەڵسوکەوتەکان شی بکەنەوە و هۆکاروو پاڵنەرەکانی دەربخەن، چونکە لێکۆڵینەوە لەسەر منداڵ بەپێوەرێکی گرنگ دادەنرێت بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگە

منداڵیش وەکو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ تووشی گرفت دەبن کە کاریگەری نێگەتیڤانەی لەسەر ژیان و رەفتاریان بەجێ دەهێڵێت، ومنەو گۆڕانکاریە زۆر و بەخێرا یەی کەئەمرۆ بەسەر جیهاندا هاتووە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، بۆ وڵاتە پێشکەوتوو سەرمایە دارەکان بەکەڵك و بەسودە، چونکە ئەوان هەموو قۆناغەکانی ژیانیان پلە پلە بڕیوە و گەیشتوون بەو ئاستەی پێشکەوتن. بەلام بۆ ووڵاتە هەژاروو دواکەوتووە کان لەگەڵ سوودەکانیدا گرفتی زۆری دروست کردوە لەهەموو ڕویەکی ئابووریو پەروەردەیی و ڕۆشنبیری یەوە، بەلام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە ووڵاتە پێشکەوتووەکان و سەرمایەدارەکان منداڵانیان بێ گرفتن بەڵکو بەشێوەو ڕێژەی جیا جیا تووشی گرفت و ناخۆشی دەبن بەلام ئەم گرفتانە بەزۆری لای ووڵاتانی جیهانی سێهەم ووڵاتە هەژارەکان هەیە

چونکە ئەوان ناتوانن شان بەشانی ئەو پێشکەوتنە خێرایە بڕۆن، کەئەمەش لاسەنگییەك دروست دەکات و دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کێشەو گرفت. ئەم کێشەش بەزۆری بۆ منداڵان کاریگەرتر دەبێت، چونکە خێزانە هەژارەکان ناتوانن پێداویستیەکانیان دابین بکەن لەبەرئەوە منداڵەکانیان دەنێرن بۆئیش کردن بۆ هاریکاری خێزانەکانیان، گرفتی منداڵانی سەرجادە یەکێکە لەو گرفتانەی کە لەئەمڕۆی جیهاندا بۆتە کێشەیەك زۆربەی وولاتانی جیهانی گرتۆتەوە، ئەو منداڵانەی کەلەسەر جادەکان ژیان بەسەر دەبەن بۆ پەیداکردنی قوتی ژیانیان، ئەومێرد منداڵانەی بەهۆی نالەباری ژیان و گوزەرانەوە ڕایان کردووە یاخود لەخێزان هاتونەتە دەرەوە بۆسەرجادە، ئەویش بەهۆی تێرنەکردنی حەزو ئارەزووەکانی مێرد منداڵ یان بەهۆی هەژاری و کەم دەرامەتییەوە یان بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزانەوە یان نەبوونی سەرپەرشتی گونجاو لەخێزاندا هاتونەتە سەرچاوە، هەروەها ئەم مێرد منداڵانە بەچەند ڕێگایەك بژێوی ژیانیان لەسەرجادە پەیدادەکەن وەك (دەزگیری، پاککردنەوەی شوشەی سەیارە، دزیکردن، بۆیاخ کردن، لەش فرۆشی، فرۆشتنی مادە بێهۆشکەرەکان، ... ) بۆیە گرنگی دان بەچارەسەری ئەم گرفتە لەڕێگەی توێژینەوەی زانستی یەوە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە بەتایبەتی کەلەناوچەکەدا لەم جۆرە توێژینەوانە نەکراوە .

**ئامانجی توێژینەوەکە :-**

١. هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان لەخێزانەوە بۆ سەرجادە.
٢. ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بەهۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان بەپێی گۆڕاوی ڕەگەز .

٣. ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بەهۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان بەپێی گۆڕاوی شوێنی نیشتە جێبوونیان .

**نمونەی توێژینەوەکە :-**

نموونەی توێژینەوەکە هەموو ئەو مێرد منداڵانە دەگرێتەوە کەهاتونەتە خانەی منداڵانی سەرجادەی کوڕان وخانەی منداڵان ی سەرجادەی کچان لەبەرواری ٢٠٠٢/١/١تاکوو ٢٠٠٢/٦/٣٠کەژمارەیان ٨٦مێرد منداڵ بوو لەوانە ٦٠مێرمنداڵی کوڕو، ٢٦مێرد منداڵی کچ بوو .

**- ئامرازی توێژینەوەکە :-**

لەبەرنەبوونی پێوەرێکی ئامادەکراو بۆتوێژینەوەکە توێژەر لەڕێگەی (دراسة استطلاعیة)وە کەبریتی بوو لەپرسیارێکی کراوە بەشێوەی فۆڕم ئاراستەی ١٠بەخێوکەر لەخانەی منداڵانی کچان و ١٠بەخێوکەر لەخانەی کوڕان کرا، هەروەها توێژەر سوودی لەچەند سەرچاوەیەکی تریش وەرگرتووە بۆ ئامادەکردنی دەستەواژەکان .

**-ئامرازە ئامارییەکان :-**

توێژەر ئەم ئامرازە ئامارییانەی بەکارهێناوە بۆجیاکردنەوەو شیکردنەوەی زانیارییەکان:

١. ناوەندی ژمارەی (وسط الحسابی)

٢. هاوکۆلکەی پەیوەستی بیرسۆن(معامل ا رتباگپیرسۆن)

٣. هاوكێشەی میشەر (معادله فیشەر).

٤. دووجای کای (مربع کای).

## -ئه نجامی توێژینەوەکە :

ئەنجامی توێژینەوەکە هەریەکەیان بەپلەی جیاواز بەدەست هاتووە و شیکردنەوەی زانستی بۆ کراوە.

سەبارەت بەئامانجی یەکەم (هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان لەخێزانەوە بۆ سەر جادە، دەستەواژە ی(٢١) تێرنەکردنی حەزو ئارەزووەکانی مێرد منداڵ)هێزی (٤٧،١ ) کەبەپێی هاوکێشەی فیشەر بەپلەی یەکەم بەدەستهێناوە، لەم ئەنجامەشەوە دەتوانین بڵێین کەزۆرترین ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی ڕاکردنی مێرد منداڵان لەخێزان لەئەنجامی تێرنەکردنی حەزوو ئارەزووەکانیانەوەیە چونکە لەو قۆناغەدا مێرد منداڵدا زۆر پێویستە گرنگی بەحەزوو ئارەزووی بدرێت کەپێویستە بۆ بنیاتی کەسێتی و گەشەی کۆمەڵایەتی و جەستەییو ژیری. سەبارەت بەئامانجی دووەم (ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بەهۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان بەپێی گۆڕاوی ڕەگەز)لەئەنجامدا دەرکەوت کەهەندێك لە دەستەواژەکان بوونی جیاواز دەردەخەن لەنێوان ڕەگەزی نێر ومێدا وەکو (قورسکردنی باری سەرشانی مێرد منداڵ بەئیشکردن)، هەروەها هەندێکی تریان بوونی جیاوازی دەرناخەن وەك (بوونی ئاژاوە لەناو خێزاندا )، سەبارەت بەئامانجی سێهەم (ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بەهۆکارەکانی ڕاکردنی مێردمنداڵان بەپێی گۆڕاوی شوێنی نیشتەجێبونیان )،

لەئەنجامەکـەدا دەرکـەوت کەهەنـدێك لەدەسـتەواژەکان بـوونی جیـاوازی دەردەخەن لەشوێنی نیشتەجێبوونی مێرد منداڵاندا وەك (ترسان لەسزای ئـەو هەڵەیـــەی کەکردوویـــەتی ) بـــەڵام هەنـــدێکی تریـــان بـــوونی جیـــاوازی دەرنەدەخست وەك(بوونی هاوڕێی خراپ).

# ناوەڕۆك



## بەشی یەكەم

## بەشی دووەم



## بەشی سێهەم

## بەشی چوارەم



## بەشی پێنجەم

# جێگیری نەخشەکان

# جیگیری پاشکۆکان

## بەشی یەکەم

### گرنگی توێژینەوەو پێویستیەکەی

ئامانجی توێژینەوەکە

سنوری توێژینەوەکە

پێشاسەی زاردوەکان

گرنگی توێژینەوەو پێویستیەکەی :

قوناغی منداڵی، ئەو دونیاجوان و پاکیزەیەیە، کەبریتیە لەخەیاڵ و خواست و خۆزگەو هیواو بەرانەت وزۆر لە حەزو ئارەزووەکان تیادا گەشەدەکەن، منداڵ جوانی و پێکەنینی ژیانەو ئاراستەی سەرەکی بنیاتنانی شارستانێتی و کەسێتی مرۆڤە (العانی، ١٩٩٩، لا٢٤).

هەربۆیە زۆربەی زانایان توێژەران لەتوێژینەو باسەکانیاندا جەخت دەکەنە سەر قۆناغەکانی منداڵی بەهەموو گۆڕانکاری و کێشەو پێداویستیەکانیانەوە، تابتوانن ئاکاروو هەڵسوکەوتەکان :

شی بکەنەوە هۆکاری پاڵنەرەکان دەربخەن، چونکە قسەکردن لەسەر ڕەفتارێک و ئامانج و فاکتەرەکانی ئەو ڕەفتارە بەبێ توێژینەوە لەسەر قۆناغەکانی منداڵی مەحاڵە، هەر لەم ڕوانگەیەوە هەرزانستێک یان کارێک کەبۆخزمەتی منداڵ بکرێت، مات بوونێکی مرۆڤانەی جوانەو کارێکی ئامانج پێشکەریشە، چونکە زانین وڕۆشنبیری لەسەر ژیان و دەروونی منداڵان کەمترە لەوەی کەمرۆڤ لەم سەردەمەدا داوای دەکات (عضحاوی، ٨٨، لا١١)بۆیە ئەگەر چاوێك بەمێژووی مرۆڤایەتی بخشێنین، ئەوا دەبینین کەگرنگی دان بەمنداڵ و قۆناغەکانی گەشەکردنی و کێشەو پێداویستیەکانی

بەپێی ئاستی ڕۆشنبیری و شارستانی کۆمەڵگەو بەپێی زانیاریەکانی ئەو قۆناغە

مێژووییانە، پێگەیەکی تایبەتی گرتووە شێوازێکی پەروەردەیی بۆ منداڵ دەستە بەر کردووە، ئەگەر چی ئەو شێوازو ڕێگایانە بەپێی بەلگەی زانستی و پەروەردەیی نەبوو، بەڵام گرنگی دان و توێژینەوەو زانیارییەکانی لەسەر پەروەردەو قۆناغەکانی منداڵ گرنگی ئەو قۆناغە دەردەخات،

نموونەی ئەو گرنگی دانەش لەمێژوودا زۆرن، وەك وردبونەوەو سەرنج دانی بیکات باوکان لەهەڵسوکەوتی منداڵەکانیان لەهەموو قۆناغەکانی گەشەداو گێڕانەوەی بۆ نەوەی دواتر، کۆماری افلاطون کەتیایدا جەخت دەکاتە سەر پەروەردەی منداڵو دەیخاتە ئەستۆی دەوڵەت، پەروەردەی یۆنانی کۆن بۆ گەشەی جەسەدی منداڵ وفێرکردنی ئاکارو ڕەفتاری تایبەت و ئامانج...هتد)

لەم سەردەمەشدا گرنگیەکی زۆر بەمنداڵ دراوە، بەتایبەتی لەلایەن پسپۆڕان و خێزانەوە .ئەم گرنگی پێدانەش دەگەڕێتنەوە بۆ گرنگی قۆناغی منداڵی لەژیانی تاکدا، کەزۆرر شارەزایی و زانیاری تیایدا وەردەگرێت خوێندنی سەرەتایی دەبێت کەبنچینەیە بۆ کرداری فێربوون، بۆیە لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە گرنگی خۆی هەیە (قطانی، ١٩٩٧، لا ١٨) .

جگە لەمە گرنگترین پرۆسەکەتان فێری دەبێت لەم قۆناغەدا، پرۆسەی بەکۆمەڵایەتی بوون و گەشەی کۆمەڵایەتیە، کەمنداڵ لە لەبوونەوەرێکی بایلۆژی یەوە دەگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، خۆ ئەگەر هاتوو

یەکـە کۆمەڵایەتیـەکان بەتایبـەتی (خێـزان و قوتابخانـە)، لـەم پرۆسـەدا دەورێکی پۆزە شیخانەیان هەبوو، ئەوا کرداری پەروەردەکردنیش پۆزە تیف دەبێت، وەئەگەر پرۆسەکە بەپێچەوانەوە ڕووی دا، ئەوا کـرداری پـەروەردە کردنیش پێچەوانەیە واتە (نێگەتیف)دەبێت، بۆیە لەم حاڵەتـەدا پێویستـە پارێزگـاری لـە منـداڵ بکرێـت و لـە کاریگـەری و مەترسی ئـەو پـەروەردە نادروسـتـە بپـارێزرێ، بـەڵام پارێزگـاری کردنـی منـداڵ لەمەترسـی تـەنها تێڕامان و زانین نابێت، بەڵکو ئـەوە کـارێکی ئـاڵۆزو گرانـە کەپەیوەندیـەکی تونـدو تـۆڵی بـە خەفـەت و کێشـەکانی ژیـانی کۆمەڵـەوە هەیـە پێویستی بەبەرنامەیەکی دارێژراوە بۆ جێبەجێ کردنی، جگە لەمە پێویستی بەدوادا چـونی بەردەوامــەو، چـونکە گرنگـی دان بەمنــداڵ و پارێزگـاری کردنــی لەپەروەردەیی نادروست و سازانـدن و گونجانـدنی هۆیەکانی ژیانێکی لەباروو پەروەردەیـەکی دروسـت بـۆ منــداڵان و نـەوەکانی دوارۆژ پێشـبینی یـەکی شارستانی و مرۆڤانەیە، بۆبەردەوامی و جوانی کۆمەڵگە، بۆیـە جـوانکردنی کۆمەڵگــە دەبێــت بەشــێك بێــت لــەکاری ڕۆشــنبیران دایکــان وباوکــان و لێپرسراوان، ئەویش لەرێگەی هەوڵـدان بـۆ دڵخۆش کردنـی منـداڵ، چونکە کارکردن بۆ منداڵی دڵخۆش، واتە کارکردن بۆ کۆمەڵگەیەکی دڵخۆش، بۆیـە دەبێت گرنگی دان بەقۆناغی منداڵی بەشێکی سەرەکی بێت لـەکارکردن مبـۆ بەرەو پێشچونی کۆمەڵایەتی (العظماوی، ١٩٨٨، لا١١) هـەموو لایـەك دەزانـین کەمنداڵ پیاوی دوارۆژە پاراستنی چارەنوس و شەرەف و کەرامەتی هـەموو گەل و نەتەوەیەك لەئەستۆی ئەواندایە، ئەگەر کۆمەڵگە نەیتوانی ژینگەی لـەباروو گونجـاو بـۆ ڕۆڵـەکان دابـین بکـات و پێداویسـتیە گرنگـی یـەکانی

گەشــەکردنی منداڵــەکانی تێرنــەکردوو دامــەزراوە کۆمەڵایەتیــەکانیش لەپێش هەمویشیانەوە خێزانن. شارەزایی سایکۆلۆژیەتی منداڵ نەبوون، ئەو کاتــە چــارەنوس و پاشــەڕۆژی ئــەو کۆمەڵگایــە دەکەوێتــە مەترسییەوە (قەرەچــەتانی، ١٩٧٧، لا٣)بۆیــە هــەموو کۆمەڵگەیــەك لەقۆناغــەکانی گەشــەکردنی خۆیــدا، پێویستــی بەچــەندین پرانسیــپ و بنــەمای ســەرەکی هەیە، بۆئەوەی بتوانێت قۆناغ بەقۆناغ

بەرەو ئایندەیەکی گەشاوەتروو پێشکەوتوتروو ئاسوودە تـر هـەنگاو بنێت، یەکێکیش لەو بنەما سەرەکیانەی کەتەلاری ئایندەی هەموو کۆمەڵگایـەکی لەســەر بنیــات ئــەدرێ، شــێوازی پــەروەردەکردنی منداڵــە لــەڕووی ژیــری و سایکۆلۆژی و جەستەیی یەوە (کەساس، ١٩٩٩، لا٣)

گرنگی قۆناغە منداڵی لەئەنجامی ئەو لێکۆڵینانەوە هات کەدڵنیایان کردەوە، کاریگەری قۆناغی منـداڵی لەسـەر کەسێکی تـاك پۆزەتیڤانـەو نیگـە تیڤانـە دەردەکـەوێت بـەپێی ئـەو بـارودۆخ و ژینگەیـەی کەتیایـدا ژیـاوە، ئـەم بـۆ چونەش لایـەنگری فکـرەی فرۆیـو دەکاتـەوە لەسـە گرنگـی دان بـە قۆنـاغی منـداڵ، بەتایبـەتی لـەپێنج سـاڵی یەکـەمی تەمەنیـدا کەکاریگـەری دەبێـت لەسەر ژیانی داهاتووی (قطایي، ١٩٩٧، لا١٩)

لــەم ڕووەوە زۆربــەی زانایــان چ ئەوانــەی کەلایــەنگری بــۆ مــاوەن و چ ئەوانەش لایـەنگری ژینگـەن و چ ئەوانـەی لایـەنگری هـەردوو بۆچـونەکەن، زۆربەی زۆریان لەسەر گرنگی قۆناغی منداڵی کۆکن بەبناغەیـەکی کەسێتی بـەهێزی دادەنـێن، ڕەوشـتییەکان دەڵـێن ژیـری منـداڵ لاپەڕەیـەکی سپیە، ئــەوەی کــەپوی دەکاتــەوە، ئــەوا ژینگەیــە کەتیایــدا دەژی (جــۆن لــۆکیش)

لایەنگیری دەکات و جەخت دەکاتەوە کەمندال لەڕێ ی هەستەوەرەکانەوە فێری دەبێت . بۆیە دەبێت کۆمەلگە ئاگاداری شێوازەکانی پەروەردەکردن و گەشەی هەستەوەرەکانی مندال بێت، چونکە چارەنوس وپێشکەوتنی هەموو نەتەوەیەك پابەندە بەچۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵەکانیانەوە، گرەوی مێژوش ئەو کۆمەلگایانە دەیبەنەوە کەمنداڵەکانین بەشێوەی زانستی پەروەردە دەکەن و بەبیری پێشکەوتنخوازانەو گیانی برای وهاوکاری گۆشیان دەکەن( قەرەچەتانی ١٩٩٧، لا٣) وەك ئاماژەمان پێدا مندال لەڕێی پرۆسەی ڕاهێنانی کۆمەلایەتیەوە بونەوەرێکی بایۆلۆژیەوە، دەگۆڕێت بۆ بونەوەرێکی کۆمەلایەتی، خێزان و قوتابخانەو هۆیەکانی ڕاگەیاندن(تەلەفزیۆن، ڕادیۆ ڕۆژنامەو گۆڤار) و هاوڕێ وکۆمەل و داب ونەریت، بەشێکی سەرەکین لەپرۆسەی ڕاهێنانی کۆمەلایەتی و ڕۆلی گرنگ دەبینن لەچۆنیەتی پەروەردە کردنی مندال چونکە هەریەکێك لەم دامەزراوە

کۆمەلایەتیانە لەهەرشوێن وکاتێك دابێت، ڕۆلی تایبەتی خۆیان هەیەو کار لەلایەنێك لەلایەنەکانی ڕەوشتی مندال دەکات ونەمەش ڕەنگدانەوەی دەبێت لەژیانی داهاتویدا، ئەگەر خێزان و قوتابخانەو ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و کۆمەل لەخزمەتی منداڵدابون و بەرنامەو پرۆگرام وشێوازەکانی پەروەردەکردنیانن لەتەك سایکۆلۆژیەتی منداڵدا چون یەك بوو، ئەوکاتە لەوە دلنیا دەبین کەنەوەکانی داهاتومان پاشەڕۆژو چارەنسی ئەم گەلو نەتەوەیە بەرەو هەلدێر نابەن ودەیپارێزن (قەرەچەتانی، ١٩٩٧، لا٣)هەرچەندە گرنگی دان بەمندال کۆنە بەلام لێکۆلینەوەی زانستی باسی

سەردەمەو لێکۆڵینەوەکانی سەرەتا باسکردن وخستنە ڕووبووە، وەکو گرنگی دان بەقۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ وخاسیەتی قۆناغێك لەو قۆناغانەو بەلآم ئەو لێکۆڵینەوانەی دواتر هاتن قۆناغی خستنە ڕوو باسکردنی بەزاند بۆ گەڕان لەپەیوەندی هۆیی، یان پەیوەندی دیاردەیەك لەدیاردەیەکی ترەوە، یان پەیوەندی گۆڕاوێك بەگۆڕاوێکی ترەوە، لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوە لەسەر منداڵتایبەت نیە بەزانستێك،
یان بەشێك لەبەشەکانی زانین، بەڵکو جێگای گرنگی پێدانی هەموو زانستە مرۆڤایەتیەکانە (قطامی، ١٩٩٧ل١٩)

لێکۆڵینەوە لەسەر منداڵ وبەپێوەرێکی گرنگ دادەنرێت بۆ پێوانەکردنی پێشکەوتنی کۆمەڵگا ئەم گرنگ پێدانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەمنداڵ چینێکی گەورە پێك دەهێنێت لەناو کۆمەڵداو دەبنە نوێنەری هەموو میللەت لەداهاتوداو بەم پێیە لێکۆڵینەوە لەسەر منداڵ، یەکێکە لەداواکاریی یەکانی گۆڕانی کۆمەلأیەتی(قطامی، ١٩٩٧، ل٢١) شیاوی ئاماژە پێکردنە کەسەرەتای دەرکەوتنی توێژینەوەی زانستی لەسەر منداڵ دەگوڕێتەوە بۆ زانای دەرونزانی(ستانلی هۆل)، کەگرنگی بەپێکهاتەکانی ژیری منداڵ داوەو هوڵی داوە بەشێوەیەکی زانستی و بەرێگەی ڕاپرسی توێژینەوەی زانستی لەسەر منداڵ ئەنجام بدات. ئەو گۆڕانکارییە گەورەو خێرایەی کەئەمرۆ بەسەر جیهاندا دێت لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، بۆ وولأتە پێشکەوتوە سەرمایەدارەکان(وولآتانی ڕۆژئاوا) بەسوودە، چونکە قۆناغەکانی ژیانیان پلە پلە بڕیوە، تاکو گەیشتوون بەو ئاستەی پێشکەوتن،

بەلام بۆ وولاتە دواکەوتوودکان و وولاتانی جیهانی سێهەم ئەم پێشکەوتنە لەگەڵ سودو قازانجەکانیدا گرفتی زۆری بۆ دروست کردون لەهەموو روویەکی ئابوری و پەروەردەیی و رۆشنبیریەوەدو بەلام ئەمە مانای ئەوەنیە کەوولاتە پێشکەوتوودکان دووربن لەگیروگرفتی منداڵ و بەلکو ئەوانیش بەرێژەی جیاجیا توشی ئەو گرفتانە بوون کەلەئەنجامی پێشکەوتنی بوارەکانی ژیاندا دەردەکەون بەلام ئەو گیرو گرفتانە زیاتر لای وولاتانی جیهانی سێهەم دەردەکەون و چونە ناتوانن شان بەشانی ئەو پێشکەوتنە خێرایە برۆن، کەئەمەش لاسەنگیەك دروست دەکاتو دەبێتە هۆی سەر هەڵدانی گیرو گرفت لای وولاتانی جیهانی سێهەم وئەم گرفتانەش لەسەر خێزانەکانیان رەنگدەداتەوەو بەتایبەتی خێزانە هەژارەکان کەوایان فێردەکات نەتوانن پێداویستیەکانی ژیانیان دابین بکەن کەلە نزم بونەوەی ئاستی بژێوی ژیانیان دا خۆی دەبینێتەوەو وایان لێ دەکات کەلەخۆشی ژیان بێبەش بن و هەموو ژیانیان تاڵی وناخۆشی بێتووە ئەم ناخۆشی وتاڵیە لای توێژێکی خێزانە هەژارەکان لەناو کۆمەڵدا زۆر کاریگەر دەبێت کەزۆر ناسکن وبەرگەی ناخۆشی وتاڵی ژیان ناگرن. ئەوانیش منداڵ ومێرمنداڵن کەیەکەم کەسن زەرەر مەند دەبن لەم گرفتەدا، ئەمەش وا لەخێزانەکان دەکات منداڵەکانیان بێرن بۆ ئیش کردن، کەدەبێتە هۆی لەدەستچونی بەشێکی زۆر لەخۆشی و حەزو ئارەزووەکانی، بۆیە ئەم کردەوەیە کارێکی نامرۆڤانەیە، چونکە منداڵ و مێرمنداڵ لەو تەمەنەدا پێویستی زۆری بەچاودێری و(مراعات) کردنە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باش و پەروەردەییانە گەشە بکات. ئیشکردنی منداڵان زاراوەیەکی وروژێنەوە بۆ مشتومرو

گەنوگۆ کردن، لێرەدا ئەو داواکارییەی کەدایك لەمندالْ داوا دەکات پەداخێك ناوی بۆ بهێنێت دوو لایەنەیە، هەندێك بەکارێکی نامرۆڤانەی دادەنێن، چونکە دەچێتە بواری ئیشکردنی مندالأنەوەو بەلأم هەندێکی تر ئەم جۆرە ئیشکردنە بە بەشێك لەپەروەردەکردنی مندالْ دادەنێن و بەلأم هەرچۆنێك بێت ئیشکردنی مندالْ کاریگەری خۆی هەیە لەسەر مندالْ، لەڕوی دەرونی وجەستەیی وکۆمەلأیەتیەوەو، لەگەلْ ئەوەش دا بەدیلی بەردەوامی ژیان لای مندالْی خێزانە هەژارەکان دووریگایەو یەکەمیان ئەوەیە کە بەهەژاری و ناخۆشی لەگەلْ خێزانەکانیاندا بژین ودووەمیان دەرچونیانە بۆ ئیش کردن بەمەبەستی یارمەتی دانی خێزانەکانیان و هەرچەندە لەوانەیە ئەمە گرفتی دەرونی و جەستەیی وکۆمەلأیەتی بەدوادابێت بەدرێژایی ژیانیان (محمد علی، ٢٠٠٢، ئەنتەرنێت).

شایانی ووتنە کەلەزۆرشوێن و سەرچاوەدا بە ئیشکەر دەلْێن مندالأنی سەرجادە، ئەویش بەهۆی لەیەکچونی ووۆر لەخاسیەت و تایبەتمەندی مندالأنی ئیشکەر لەگەلْ مندالأنی سەرجادەو لەڕوی شوێنی ئیشکردن وهەلْسو کەوتیانەوە چونکە زۆر هەلْسوکەوتی مندالأنی سەرجادە لەهەلْس و کەوتی مندالأنی ئیشکەر دەچێت، هەروەها لەڕووی مانەوەیان لەشوێنەکاندا، وەك (شوێنەگشتیەکان، گەراجەکان وگازینۆکان، ترافیکەکان)، بەشێوەیەکی گشتی مندالأنی سەرجادەو مندالأنی ئیشکەر لێکچونیان زۆرە. لەم جیهانەدا، لەزۆربەی شارو وولأتاندا، باس لەگرفتی مندالأنی سەرجادە دەکرێت ئەو مندالأنەی کەخۆیان ژیانی خۆیان پەیدادەکەن و بەشەقامەکانی شاردا دەگەڕێن ودەسوڕێنەوە (غیشورو، ١٩٨٧ولا١٥٩) هاتنە دەرەوە یاخود ڕاکردنی

مێرمنـدالآن لـەخێزان، دیاردەیـەکی دیـارو بەرچـاوە لـەڕۆژگاری ئـەمڕۆداو چونکە ژیان پڕیەتی لەکێشەو گرفت وبەردەوام بونی زەحمەتە، هیچ تاکێك نیـە لـەم کۆمەڵگایـەدا گیروگرفتـی نـەبێت. مێرمنـدالآنیش کـەتاکێکن لـەم کۆمەڵگەیە ومبێ بەش نـین لـەتاڵی وناخۆشـی ژیـان. بـەڵکو ئـەوانیش وەکـو گەورەکان توشی ناخۆشـی وکێشـەکانی ژیـان دەبـن و بـەلآم ئـەم کێشـانە لای مێرمنـدالآن نـامۆن و مێرمنـدالآن نـاتوانن بـەرەنگاری ببنـەوەو چارەسـەری بکەن، بۆیە پەنا دەباتە بەرچەندین ڕێگا بۆ دەرباز بـوون ڕزگـار بـوون لـەو گیروگرفتانــە کــە دیارترینیــان ڕاکردنــە لــەو بــارو دۆخــەی کەتیایــەتی. ئەوشـوێنانەش کەمنــداڵ لەســەرەتادا خــۆی لێ دەدزێتــەوەو لیٚ ی ڕادەکـات قوتابخانەیە، چونکە ڕاکردن لەقوتابخانە دیاردەیەکی زانراوو دیارە لەهەموو کۆمەڵگەیەکدا کەمنداڵ وەکو ڕێگایەکی فێڵبازی پشتی پێ دەبەستێو دەڵێ دەچم بۆ قوتابخانەو ئەمـە چەند جارێك دووبـارەی دەکاتـەوە وکتێبـەکانی هەڵـدەگرێت و دەچـێتە شـوێنێکی چۆڵ و دوور لەخـەڵك، لەوانەیـە ئـەم دیاردەیـە هەوڵـدانێکی سـەرەتایی بێـت لـەنارەزووکردنی منـداڵ بـۆ ڕاکـردن لەماڵەوە، چونکە ئەومنداڵەی لەقوتابخانـە ڕادەکات لەقوتابخانـە ناترسێت، بــەڵکو حــەزناکات بچــێت لــەپێناوی خــۆ ڕزگــارکردن لەسیســتمەکەی و ئەرکەکانی، واتە سوورە لەسەر دوورکەوتنەوەو وازهێنان لەئازارەکـەی وبـەم شێوەیە ناگەڕێتەوە بۆ ماڵ تاکاتی تەواو بونی ماوەی قوتابخانەو گەرانەوەی قوتابییەکان بۆ ماڵەوە(العظماوی، ١٩٨٨، لا٢٠٨)

ڕاکردنی مێرمنداڵ لەقوتابخانە هەنێك جار لەوەوە دەست پێ دەکات کـەبۆ جێبەجێکردنی ئامانجێك و یا تێرکردنی ئارەزویەك بێت، وەك (ڕۆیشتن بـۆ

سەیرکردنی یاری تۆپی پێ یان مەلە کردن، یان ڕۆیشتن بۆ سینما) هەنێك جاریش بەبێ هۆیەکی ڕوون وئاشکرا ڕوودەدات و بەلاّم بەهەرشێوەیەك بێت دوورکەوتنەوەی مێرمنداڵ لەقوتابخانەو خێزان باروودۆخێکی تایبەت دەرەخسێنێ کەپێویستی بەتێڕامان وبیرکردنەوە هەیەو چونکە زۆر جارمێرمنداڵ توشی گرفتی ترسناك وەك لادان دەبێت. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، ئەو مێرمندالأنەی کەڕادەکەن لەقوتابخانە، ئەو توانایەیان هەیە کەڕاکردنەکەیان بشارنەوەو ئاشکرای نەکەن، بۆیە ئەم کردەوەیە بەشارراوەیی دەمێنێتەوەتاکاتێکی دوور

زۆرجار خێزانی ئەم مێرد مندالأنە کاتێ ڕاکردنی مێرمنداڵەکانیان بۆ ئاشکرا دەبێت کەمنداڵەکەیان توشی لادانێك یا کەتنێك بووەو ئەم ئاشکرابونەش بۆ خێزانی مێرمنداڵ زۆرجار بەڕێکەوت دەبێت ئەویش لەڕێی هاوڕێ ی مێرمنداڵەکەیانەوە، یان سەردانی قوتابخانەکەی و ڕاکردن لەقوتابخانە دیاردەیەکە لە کوڕان دا ڕوودەدات. بەلاّم ئەم ڕاکردنە بۆ کچانیش ڕاستە هەرچەندە ڕاکردنی کچان لەقوتابخانە زۆرکەمەو زۆر بلأونیە، بەلاّم ڕاکردنیان لەخێزان دیاردەیەکی بەرچاوەو ئەویش کەلەڕاکردنی قوتابخانە ترسناك تروە ئەو ڕاکردنەیە کەلە خێزاندا ڕوودەدات ومنداڵ پەنا دەباتە بەرچونە دەرەوەی ئەو خێزانەی گەلێ ی دەژی‌و ئەمەش بەدووڕێگا، یا ئەوەتا مێرد منداڵەکە پێشتر بیری لەڕاکردن کردۆتەوەو نەخشەو پلانی بۆ داناوەو یا تەنها بیرێکی کتوپڕییەو بەرگەی دواکەوتن ناگرێت ودەبێت جێبەجێ بکرێت وڕاکردن لەخێزان حاڵەتێك نیە کەمێرد منداڵ بەهەڵە ڕێ ی لێ تێك بچێت، لەکاتی گەڕانەوەی بۆ

ماڵەودو کەئەمە زیاتر لای منالی بچوك و ئەوانەی لەڕووی ژیرییەوە ناتەواون ڕوودەدات وەڵکو ڕاکردن لەخێزان دیاردەیەکی ڕەفتاریی ناوازەیە(شاز) باسدتنکی تەکبیر بۆ کراوەو ئەو مێرمندالآنەی پێ ی هەڵدەستن کەتوسی گرفتیکی دەروونی کاریگەر یان هەڵچونێکی ڕەوشتی دەبن ترسناکەکەی لەقۆناغی هەرزەکاریدا زیاد دەکات وبەتایبەتی لەحالەتی ڕاکردنی کچانداو ئەو قۆناغەش کەئەم مێرمندالآنەی پیادا تێپەڕدەبێت زۆر ناسکە وگۆڕانکاری زۆری تیادا ڕوودەدات و بۆیە دەبێت وەك دیاردەیەکی ترسناك ناگامان لێ ی بێت بەڕێگای دەروونی و پەروەردەیی نوێ ڕووبەڕووی ببینەوە(العظماوی١٩٨٨، لا٢٠٨ ٢١١) کۆمەڵگای ئێمەش وەکو کۆمەڵگاکانی تری جیهان وبێ بەش نیە لەو کێشەو گرفتە دەرونی وکۆمەلآیەتیانەو چونکە وولآتەکەمان بەقۆناغێکی ناسك و ترسناك دا گوزدر دەکات. ڕاکردنی مێرمندالیش لەخێزان و یەکێکە لەو گرفتە ترسناکانە کەئەمڕۆ ڕوبەڕوی کۆمەلگەکەمان بۆتەوە و ڕۆژانە چەندین مندال دەبینین کەلەسەر شەقامەکان و ئەو کارەی دەیکەن لەگەڵ تەمەن ولەش و لاریان دا ناگونجێ ونەمەش کاریگەری ترسناکی لەسەر داهاتویان دەبێت وجگە لەمە زۆرمندال دەبینین کەڕۆ شەو لەسەر شەقامەکان و شوێنە گشتیەکان دا بەسەر دەبەن. بۆیە ئەم گرفتە پێویستی بەگرنگی پێدان وچارە سەرکردنەو دەبێت هۆکارو ئەنجامەکانی بخرێتە بە رچاوی تاکەکانی کۆمەڵ، بەمەبەستی زیاتر ناگاداری مێرمندال و شێوازی پەروەردەکردنیان ، بۆیە ئەم بابەتە (مێرمندالآنی سەرجادە) گرنگی تایبەتی خۆی هەیە و جێ ی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیە، چونکە تائێستا

لەهەرێمی کوردستان توێژینەوەد لەسەرئەم بابەتە ئەنجام نەدراوە بۆیە گرنگی دان بەهۆکارەکانی ئەم گرفتەو وچارە سەرکردنی کارێکی ئامانج بێکەردو توێژەر دیەوێت لەرێگای ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستیەودو هۆکاری راکردنی مێرمندالآن لەخێزان وشیکردنەوەی هۆکاردکانی بزانێت ولەبەر ئەوە دیەوێت گرفتەکە لەهەرێمی کوردستان دا بخاتە روو چونکە کێشەی (مێرمندالآنی سەرجادە)تایبەت نیە بەناوچەیەکە وە.

**ئامانجی توێژینەوەکە :-**

١ ئەو هۆکارانەی وا لەمێرمندالآن دەکەن کە را بکەن لەخێزانەوە بۆ سەرجادە. لەدیدی بەخێوکەردکانیانەوە بۆ هەردوورەگەز.

٢ ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بەهۆکارەکانی راکردنی مێرمندالآن لەخێزانەوە بۆسەر جادە.

٣ ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بە هۆکارەکانی راکردنی مێرمندالآن لە خێزانەوە بۆ سەرجادەو بەپێی شوێنی نیشتە جێ بونیان(شارو شارۆچکەو کۆمەلگاو لادێ).

**سنوری توێژینەوەکە :-**

توێژینەوەکە تەنها بەخێوکەری ئەو مندالآنە دەگرێتەوە کەهاتونەتە خانەی مندالآنی سەرجادەی کوران وخانەی مندالآنی سەرجادەی کچان لەسلێمانی لەسالی ٢٠٠٢دا.

**پێناسەی زاراوەکان:-**

١ مێرمندالّ:

لەیاسای سزادانی عێراقیدا پێناسەی مێرمندالّ بەم شێوەیە کراوە:

" ئـــەو کەســـەیە کەحـــەوت ســـاڵی تـــەواو کـــردووەو نەگەیشـــتۆتە هەژدەساڵ"(قانون العقوبات العراقی ١٩٦٩/١٥)

**لەیاسای سویدیش دا بەم شێوەیە پێناسە کراوە:**

( ئەو منداڵە بچوکەیە لەکاتی لەدایك بونیەوەو تاکو دەگاتە ئـەو تەمەنـەی یاسای سویدی دایناوە بۆ باڵغ بوون

کەلەتەشریعی یاسای سویددا ١٨ ساڵە) (ابوخدار، ١٩٩٧)

( یاسا تەمەنی مێرمنداڵی دیاری کردوە لەنێوان ٧ ساڵی و١٥ ساڵی بـەپێی ئـەوە تەمـەنی ١٥ سـاڵی، ئـەو تەمەنـە کەکەسێتی تـاك تیایـدا گەشـە دەکـات ودبنـەماکانی ژیـری وکۆمەلأیـەتی وئـابوری تیایـدا کامـڵ دەبێـت کـەتاك لێپرسراو دەبێت بەرامبەر ڕەفتارو هەڵچونەکانی) (عمارە. ١٩٨٦/ ٤٣٩)ز

پێناسەی توێژەر:

نەومنداڵانەی کەتەمەنیان لە٧ ساڵەودو تـاوەکو ١٨ سـاڵە و لـەو تەمەنـەدا چەندین گۆڕانی جەستەیی و

فیسۆلۆژی ودەرونی وکۆمەلأیەتی تیادا ڕودەدات.

**خێزان**

پێناسەی خێزان لەڕوانگەی (الهاشمی)یەوە:

(بریتیـە لەیەکـەمین دامـەزراوە لـەژیانی هـەموو مرۆڤێکـداو یەکـەمین دامەزراودیە کەمرۆڤەکان لەباوەشی دەگرێت و

بەخێویان دەكات و وە لەناویدا فێری بنەمانی ژیان ورەوشت ورەفتار دەبێت وجگە لەمەش لەگەڵ تاكەكانی تری خێزاندا پەیوەنییە كۆمەڵایەتیەكان دەبەستێت بەیەكەوە، لەبەر ئەوە خێزان ناودەبرێت بە (تۆخمی كۆمەڵایەتی) لەبەر دانانی بەبچوكترین یەكەی كۆمەڵایەتی پێكەوە بەستراوو بەهێز) ( الهاشمی و١٩٨٩، ل٢٥٣)

## پێناسەی توێژەر:-

یەكەیەكی كۆمەڵایەتیەو كۆمەڵگای لێ پێك دێت وتاكەكانی ژیانی لێوە دەست پێ دەكەن، كۆمەڵناسان بەدامەزراوەیەكی كۆمەڵایەتی ناو زەندی دەكەن و گرنگیەكی زۆری هەیە لەژیانی مرۆڤدا وتامردنی و ئەو ژوانگەیەو یا پێگەیەیە كەدواجار تاكەكانی كۆمەڵگا بەناچارو بەنارەزو پێویستە بگەرێنەوە ناوی وپێكی بهێنن وتیایدا بژین.

## ٣-منداڵی سەرجادە

( تێگەیشتن لەمنداڵانی سەرجادە لای پسپۆرانی كۆمەڵناسی لەئەردەن وئەو منداڵانە ناگرێتەوە كەنان وناویان نیە لەشەقامەكاندا دەمێننەوە، بەڵكو ئەو منداڵانە دەگرێتەوە كەسواڵ دەكەن و یان بنێشت دەفرۆشن ویان جامی سەیارە پاك دەكەنەوەو یان هەر ئیشێك لەوانە بچێتە لای ترافیك لایتەكان وسەرجادەكان وشوێنە گشتیەكان.(٢٠٠٢لەئەنتەرنێت)

## پێناسەی منداڵانی سەرجادە لەروانگەی (غیشورو)وە:

(ئەو منداڵانەن كەلەسەر جادە دەژین، ئەو نەخوێندەوارانەی ژیانی خۆیان بەخۆیان دابین دەكەن وئەوانەی كەبەسەر شەقامەكانی شاردا دەرۆن

ودێن کەزۆربەیان لەناوچە هەژارەکانەوە دێن، یان لەخێزانە هەژارەکانـەوە دێن و یان لەخێزانە هەڵوەشاوەکانەوە دێن) (غیشورو١٩٨٧، لا١٥٩)

(لەوولاًتانی جیهانداو منداڵ زیاتر توشی ژیانی فەقیری و هەژاری نەخۆشی وبـەدخۆراکی بـێ بـەری بـونی کۆمەلأیـەتی بـوون هـیچ پراکتیکێـك یـا نیـە کـەژیانی خۆیـان بگـۆڕن بەرێژمیەیـەکی زۆر ئـەم منداڵـە بـێ بەریانــە لەبەشێکی فراوانی وولأتاندا لەبەرئەوە جیابونەتەوە لەکەس وکارەکانیـان و یان لەناوچەکانی ترەوە هاتون بۆشار، لەبەر چەند هۆیـەکی کۆمەلأیـەتی و ئابوریو زۆربەیان سەفەردەکەن بۆ شارەکان، بەدوای ژیانێکی (پاك وخـۆش وشیاو)و بەلأم زۆربەی کات کۆتاییان پێدێت بەنیشکردن لەسەر جادەونـەم منداڵنە ناتوانن ببنە بەردی بناغەی هەرەمی کۆمەلأیەتی ومنەم منداڵنـە پێیا ن دەڵێن مندالأنی سەرجادە) (SHARAFADDIN، ١٩٩٧لا).

**پێناسەی توێژەر :**

ئەو منداڵنــەن کەلەخێزانـەکانیان دابـڕاون و هاتونەتـە سـەرجادەو یـاخود ڕایــان کــردووە بــۆ ســەرجادەو بەشــەو وڕۆژ دەمێننــەوە، بــەهۆی چــەند هۆکارێکی کۆمەلأیەتی و ئابوری و دەرونیـەوەو لەشوێنە گشتیەکان و گـەراج وگازینۆکاندا دەمێننەوەو کات بەسەر دەبەن).

**بەخێوکەر:-**

پێناسەی توێژەر:

بریتیە لەدایك و باوك یان خاڵو یان مام، یان پور، یان ئەو کەسانەی کە ئەرکی منداڵ دەگرنە ئەستۆی خۆیان سەبارەت بەبەخێوکردنیان وپەروەردەکردنیان.

## بەشی دووەم

توێژینەوەی پێشوو.

تاو و توێ کردنی توێژینەوەکانی پێشوو.

بواری تیۆری توێژینەوەکە (چوار چێوەی تیۆری).

**توێژینەوەکانی پێشوو:**

یەکەم: توێژینەوەی عبدالرحیم و تەلعەت حسن ۱۹۸۷.

دووەم: توێژینەوەی محمد سلیمان ابراهیم البیاتی ۱۹۸۵.

سێهەم: توێژینەوەی ئیشکردنی منداڵان لە ئەردەن ۲۰۰۲.

چوارەم: توژینەوەی ف. ك غیشورو ۱۹۸۲.

لەبەر نەبوونی توێژینەوەیەك کە پەیوەندی راستەوخۆی هەبێت بە توێژینەوەی ئێستاوە. ناچار بووین دەست بدەینە توێژینەوەی ناراستەوخۆ لەسەر (مێرد منداڵانی سەرجادە). منداڵانی سەرجادە.

**یەکەم: توێژینەوەی عبدالرحیم و تەلعەت حسن ١٩٨٧.**

(( بێ بەش بوونی خوێندکار لە دایكو پەیوەندی بەهەندێ لایەنی گونجاندنی کەسێتی وکۆمەڵایەتی لە قۆناغی سەرتایدا )).

## ئامانجی توێژینەوەکە :-

خوێندنەوەیەك بۆ گونجادنی کەسێتیو کۆمەڵایەتی ئەو خوێندکارانەی بێ بەش بوون لە دایکیان لە قۆناغی سەرتایدا، نەخشەکێشانی پلانێکی دەرونی -کۆمەڵایەتیو پەروەردەیی بۆ چاودێری کردنیان.

## نمونەی توێژینەوەکە:

پێکهاتبوو لە خوێندکارانی پۆلی چوارەمی سەرتایی (ئەوانەی کە بێ بەش بوون لە دایك و ئەوانەی بێ بەش نەبوون لە دایك) ژمارەیان (١١٢) منداڵ بووە. نیوەیان لەو منداڵانە بوون کەبێ بەش بوون لە دایكو نیوەکەی تریشیان لەو منداڵانە بوون کە بێ بەش نەبوون لە دایکیان، تەمەنی ئەم منداڵانە (١٠) ساڵ زیاتر نەبوو. جگە لە مە توێژەر ئەو منداڵانەی لابرد کە ڕێژەی زیرەکیان لەخوار ناوەندەوە بوو، هەروەها ئەو منداڵانەشی لابرد کە لە ئاستە باڵاکاندا بوون، ئەمەش لە پێناوی هاوسەنگی لە ڕێژەی زیرەکی هەردوو کۆمەڵەکەدا.

## ئامرازەکانی توێژینەوەکە:

توێژەر ئەم ئامرازانەی بەکارهێناوە:

١ تاقیکردنەوەی وێنەیی بۆ زیرەکی.

٢ فۆرمی باری کۆمەڵایەتی.

٣ تاقیکردنەوەی کەسێتی منداڵان.

٤ ئامرازی سوسیۆمیتری بۆ پێوانەکردنی کۆمەڵایەتی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەی کە هەیە لەنێوان ئەو منداڵانەی بێ بەش بوون لە دایک و ئەوانەی بێ بەش نەبوون لە دایک.

بەڵام ئەو لایەنانەی کە توێژەر هەوڵی داوە دەریان بخات:

١ پشت بەستن بەخۆ.

٢ هەست کردنی خوێندکار بە بوونی خۆی.

٣ هەستی خوێندکار بەسەربەستی خۆی.

٤ هەستی خوێنکار بەخۆ لەگەڵ خستن.

٥ ئازادکرنی خوێندکار لە ئارەزووی بۆ تاکێتی.

٦ نەهێشتنی نیشانەکانی نەخۆشیە دەمارییەکان لەلای خوێندکار.

بەڵام لایەنەکانی گونجاندنی کۆمەڵایەتی ئەمانەن:

١ دانان بە ئاستە کۆمەڵایەتیەکاندا.

٢ کۆکردنەوەو وەرگرتنی کارامەیی کۆمەڵایەتی.

٣ ئازاد بوون لە ئارەزووەکانی دژ بە کۆمەڵ.

٤ پەیوەندییەکان لەناو خێزاندا.

٥ پەیوەندییەکان لەناو قوتابخانەدا.

٦ پەیوەندییەکان لە ژینگە خۆییەکاندا.

**ئامرازە ئامارییەکان:-**

توێژەر تاقیکردنەوەی تائی *(T. Test)* بەکارهێناوە بۆ شیکردنەوەی جیاوازی لەنێوان منداڵانی بێ بەش لە دایك وە منداڵانی بێ بەش نەبوو لە دایك.

## گرنگترین ئەنجامی توێژینەوەکە :-

دوای دەرهێنان و شیکردنەوەی بڵاو کراوەکان دەرکەوت کە: وەڵامەکانی گونجاندنی کەسێتی لە قازانجی ئەو منداڵانە بوو کەبێ بەش نەبوو بوون لە دایك، هەروەها ئەوەشمان بۆ ڕوون بۆتەوە کە نەبوونی دایك کاریگەری زۆری هەیە لە سەر کەسێتی منداڵ، جگە لەمەش خۆ گونجاندن بەشێوەیەکی گشتی کەمترە لە خۆگونجاندنی ئەو منداڵانەی کە لە ژێر چاودێری دایکیاندا دەژین، هەروەها جیاوازی نمردی هەبوو. نە ك جیاوازی جۆری لەوەڵامدانەوە ڕەوشتیە جیاوازەکان بۆ گونجاندنی کۆمەڵایەتی بەهەموو ئاستەکانیەوە، ئەم جیاوازییەش لە قازانجی ئەو منداڵانە بوو کە بێ بەش نەبوون لە دایك، هەروەها بەڵگەی ئامارییان هەبوو، تەنها دان نان بە ئاستە کۆمەڵایەتیەکاندا ئەبێت.

جگە لەهەموو ئەمانەش توێژەر ئاماژەی بەوە داوە ئەو منداڵانەی بێ بەش بوون لە دایك، تایبەتمەندی گۆشەگیریان هەیە بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیان سستە، بە پێچەوانەی ئەو منداڵانەی بێ بەش نەبوون لە دایکیان.

## دووەم: توێژینەوەی محمد سلیمان ابراهیم البیاتی ١٩٨٥.

(( هەندێ لایەنی کەسێتی ئەو مێرد منداڵانەی دایكو باوکیان لەدەست داوە)).

## ئامانجی توێژینەوەکە:

توێژینەوەکە ئامانجی خوێندنەوەی هەندێ لایەنی کەسێتی ئەو مێرد منداڵانەیە، کە باوكو دایکیان لە دەست داوە، هەروەك لە تاقیکردنەوەی (ساکس) دەرکەوتووە، بە بەراووردکردنی بە کەسێتی ئەو مێرد منداڵانەی کە باوك و دایکیان لە دەست نەداوە بە پێی ئەم گۆڕاوانە:

١ ڕەگەز (نێر، مێ)

٢ لەدەست دان، نەمان، (ئەوانەی باوكو دایکیان لە دەست داوە، ئەوانەی باوكو دایکیان لە دەست نەداوە).

٣ ئاوێتە کردن لەنیوان گۆڕاوی ڕەگەزو لەدەست دان.

## نموونەی توێژینەوەکە:

### کرداری توێژینەوەکە:-

١ کۆمەڵەی ئەو منداڵانەی کە دایكو باوکیان لە دەست داوە لە پارێزگاکانی عێراقدا، تەمەنیان لە نێوان ١٢ ١٨ ساڵدایەو ژمارەیان (٥٩) کەسەو (٤١) کوڕو (٨) کچ.

٢ کۆمەڵەی کۆنترۆڵ: توێژەر ئەم کۆمەڵەیەی هەڵبژارد. بەرەچاوکردنی یەکسانی لەنێواتن هەردوو کۆمەڵەی کۆنترۆڵو ئەزموونی بەپێی:

أ ژمارە. توێژەر (٤١) مێرد منداڵی لەکوڕو (١٨) مێرد منداڵان لە کچ هەڵبژاردووە.

ب یەکسانی تەمەن.

ج قوتابخانەو پۆلەکان. هۆبەکان. ساڵی کەوتن.

## ئامرازی توێژینەوەکە:-

توێژەر تەواوکردنی ڕستەی بەکارهێنا. کەهی (جۆزیف ساکس)ە و تاقیکردنەوەکەی بەشێوەی کۆمەڵ جێبەجێ کردووە.

## ئامرازە ئامارییەکان:-

توێژەر ئەم ئامرازە ئامارییانەی بۆ شیکردنەوەی بلاوکراوەکان بەکارهێناوە:

١ ناوەندی ژمارەیو لادانی پێوانەی.

٢ هاو كۆلكەی پەیوەست بوونی پیرسۆن.

٣ شیکردنەوەی جیاوازی.

## ئەنجامی توێژینەوەکە :-

أ ئەنجامەکان بە پێی گۆڕاوی ڕەگەز (مێ، نێر):-

١ بوونی جیاوازی لەنێوان مێردمنداڵانی کوڕو مێرد منداڵانی کچ، لەڕاو بۆچوونیان دەربارەی دایكو جیاوازییەکە لە قازانجی ڕەگەزی مێینە بوو، بەڵام سەبارەت بەڕاوو بۆچوونیان بەرامبەر باوك لە قازانجی ڕەگەزی نێر بوو.

٢ هیچ جیاوازییەك نەبوو لەنێوان مێرد منداڵانی کوڕو مێرد منداڵانی کچدا لەم بیرو بۆ چوونانەدا (یەکێتی خێزان، ژن، پەیوەندی سێکسی، نیرەیی (غیرە)، هاوڕێو دۆست، لێپرسراوی کارو قوتابخانە، کارکەران، هاوڕێی ئیشو قوتابخانە، ترس، هەست کردن بە گوناح، توانا خۆییەکان، رابردوو، داهاتوو، ئامانج).

ب ئەنجامەکان بەپێی گۆڕاوی لە دەست دانی (دایكو باوك):

لە ئەنجامەکەدا وا دەرکەوت کە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو مێرد منداڵانەی کە باوكو دایکیان لە دەست داوە لەگەڵ ئەو مێرد منداڵانەی کە دایكو باوکیان لە دەست نەداوە لەهەموو ئەو بیرو بۆچوونو لایەنانەی کە تاقیکردنەوەی پێوانەی لەسەر کراوە، جیاوازییەکە لە قازانجی ئەو

مێردمنداڵانە بوو کە باوكو دایکیان لەدەست دابوو، یاخود زیاتر نێگەتیڤانەبوو.

ج هیچ جیاوازیەك دەرنەکەوت لە ناوێتەبوونی گۆڕاوی ڕەگەزو لە دەست دان.

## سێهەم: توێژینەوەی ئیشکردنی منداڵان لە ئەردەن ۲۰۰۲.

## ئامانجی سەرەکی توێژینەوەکە :-

١ زانینی قەبارەی گرفتی ئیشکردنی منداڵان لە ئەردەن، بەپشت بەستن بەو زانیارییە ڕوپێویانەی کە هەیە لە سەر هۆکارو بارودۆخ و ئەنجامی ئیشکردنی منداڵان.

٢ پێشنیارو ڕاسپاردە بۆ گرتنەبەری شێوازی پاراستنو چۆنیەتی چارەسەرکردنو نەهێشتنی ئیشکردنی ترسناك و نایاسایی بۆ منداڵان.

بەڵام ئامانجە لاوەکیەکانی (لقە ئامانجەکان) ئەم توێژینەوە ئەمانە دەگرێتەوە:

١ دیاریکردنی ئەو کۆمەڵە لاوەکیانەی منداڵان، کە زیاتر توشی ئیشکردن دەبن لە قۆناغی منداڵیدا،

وەك (کەوتووی قوتابخانەکان).

٢ دیاریکردنی کەمو کورتی یاسادانانی تایبەت بە خوێندنو هاوکاری کۆمەڵایەتی، کەلەوانەیە نێگەتیڤانە کاربکاتە سەر ئیشکردنی منداڵان.

٣ دیاریکردنی کەمو کورتی لە یاسایی کارو کرێکار لەئەردەن.

٤ چاو خشاندن بە بەرنامەی مەشقی پیشەییو بەرنامەی [illegible] کە ئامانجی توێژینەوەکە بوو لە قوتابخانە، ئەوەی تایبەتە بە پێشکردنی منداڵانی کەوتوو لە قوتابخانەدا (ڕاسبەکان).

## نموونەیی توێژینەوەکە:-

نموونەی توێژینەوەکە، نموونەیەکی بە ئامانجە، ئەوەك نموونەیەکی ڕوو پێوی هەڕەمەکی. ئەم شێوەیە لە دانانی نموونەکان دەگونجێت لە پرۆگرامی هەڵسەنگاندنی خێرا، کەلەم توێژینەوەیەدا جێ بەجێ کراوە، توێژینەوەکە لەسەر چوار ناوچەی دەرامەت نزم ئەنجامدار کەلەعماندا هەڵبژێردراوە، ئەویش (أحیاء نزهی، الطفایلة، جبل النصر، الدیابیة)، چوار کەمپی ئاوارە لە (الوحدات، البقعة، الرزرقاء، غزة)، وە چوار ناوچەی پیشەسازی وەکو (پرۆژەی کارگەو چاکردنی ئۆتۆمبیل) لە عەمان، لەگەڵ ناوچەی (وادي السیر، سحاب، وادی الرحم، مارکا).

## ئامرازی توێژینەوەکە:-

١ فۆرم: (استبیان): توێژەر سێ جۆر فۆرمی بەکارهێناوە، بۆ منداڵە ئیشکەرەکان، بۆ دایکی منداڵەکان، بۆ ئەوانەی کە منداڵەکان بەکار دەهێنن.

٢ چاو پێکەوتن. کە پرسیارێکی کراوە ئاراستەی ئیش کەرانی وەزارەت، ڕێکخراوە حکومیو ناحکومیەکان. یەکێتی کرێکارانو ئەوانەی منداڵ دەپارێزن هەروەها پسپۆڕان لەو بوارەدا کراوە.

٣ ئامرازی تێبینی بەکارهێناوە (الملاحظة) بۆ کۆکردنەوەی زانیاری، دەربارەی چۆنیەتی ئیشکردنو بارودۆخی منداڵان.

**ئامرازە ئامارییەکان:**

سەبارەت بەو ئامرازە ئامارییانەی کە بەکارهێنراون لەم توێژینەوەیەدا ئەمانەن:

١ ئاماری (وصفی)و شیکردنەوەی وەك (ڕێژەی سەدی و دووبارە بوونەوە).

٢ (الرزمة الاحصائية) ڕەزمەی ئاماری بۆ زانستە کۆمەلایەتیەکان

.Statistical Packoye for soual Science(sPSS)

**ئەنجامی تیوێژینەوەکە:-**

دەست نیشانی ئەوە دەکات کە ئیشکردنی منداڵ لە پرۆژەو کەرتە نارەسمەیەکاندا چڕ دەبێتەوەو زۆربەیان کاتی و وەرزین جگەلەمە ئاماژەی بەوە داوە کە ئیشکردنی منداڵان ئەنجامی هەژاریو هەست کردن بەنزم بوونەوەی دەستکەوتی کۆمەلایەتیو ئابووری بۆ خوێندن و نەبوونی چالاکی پرۆگرامی یە بۆ منداڵان. بە تیشك خستنەسەر ئەم ئەنجامە، دەرکەوت کە هەوڵدان بۆنەهێشتنی دیاردەی ئیشکردنی منداڵان، بە شێوەیەکی تەواوەتی لەماوەیەکی کورتدا کاری (واقیعی) سروشتی نیە.

**له توێژینەوە بیانیەکان:-**

**چوارەم: توێژینەوەی (ف، ك، غیشورو) ١٩٨٢.**

**(( پەروەردەی بنچینەیی بۆ منداڵانی سەرجادە لە نێروبی )).**

**ئامانجی توێژینەوەکە:-**

١.گونجاندنی ژیانێکی ئاسایی و لەبار بۆ منداڵان تاڕابهێنرێن کە چۆن بژیت لەناو کۆمەڵدا.

٢.فێرکردنی منداڵان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆی خود.

٣ وا لە منداڵان بکرێت کە بەشێوەیەکی بنیاتنەر سەیری ژیان بکەن، ئەویش بە بەدەستهێنان کەسێتیەکی پۆزەتیڤانە.

٤ بەرنامەی ئەندۆغۆ (باوەر بوون بە خود) دەخاتە مێشکی منداڵانەوەو یارمەتیان دەدات بۆ ڕوو بەڕو بوونەوەی گرفت و ناخۆشیەکانی ژیان.

٥.دابینکردنی خوێندنی سەرتایی بۆ منداڵانی سەرجادە.

**نموونەی توێژینەوەکە:-**

ئەم توێژینەوەیە بەرنامەی خوێندنی سەرتایی بۆ چوار قوتابخانەی لە چوار ناوچەی جیاوازدا جێ بەجێ کرد:

١ قوتابخانەی نیورغروسان لە گەرەکی نغو منغۆ.

٢ قوتابخانەی دێی ماتاری تەکنیکی لە دۆڵی ماتار.

٣ قوتابخانەی ئەندۆغو بۆ فێربوونی سەرتایی لە بوموانی لە بماجنفۆ.

٤ قوتابخانەی کیبیرا بۆ فێربوونی سەرتایی لە کبیرا.

## کرداری توێژینەوەکە:-

توێژینەوەکە (بەرنامەیەکی پەروەردەیی جێبەجێ کردن بوو) بۆ پەروەردەکردنی منداڵانی سەرجادە بە بەرنامەی ئەندۆغۆ بۆ پەروەردەی سەرتایی (بنچینەیی).

## ئەنجامی توێژینەوەکە:

زۆربەی ئەم قوتابخانانەی بەرنامەی ئەندۆغۆ لە سەریەك بنچینە رێکخراون کە تیایدا منداڵان پرۆگرامەکانی فێربوون لەسێ قۆناغدا وەردەگرن، پێویستە لە سەریان لە کۆتایی بەرنامەکەدا خوێندنو نوسین بەشێوەیەکی رەوان بزانن و بتوانن گیانی هاوکاری و سەربەخۆیی بەشێوەیەکی ئازایانە بەدەست بهێنن، تایارمەتیان بدات بۆ رووبەرووبونەوەی ناخۆشیو گرفتەکانی ژیان، جگە لەمەش یارمەتی دەریان بێت بۆ سەلماندن و هەست کردن بە بوونیان لە ناو کۆمەڵدا.

ئەگەر سەیری ئەم قوتابخانانەی بەرنامەی ئەندۆغۆ بکەین، جیاوازییەك بەدی دەکەینو دەبینین کە قوتابخانەی (مارتای تەکنیکی) بیناکانی تازەنو جیاوازە لەو سێ قوتابخانەی تر کە بەرنامەکانی ئەندۆغۆی تیادا جێ

بەجێ دەکرێت و بیناکانیان سادەن، جگە لە مە قوتابخانەی (ماتاری)، تەکنیکی دەکرێت بەدوو بەشەوە:

أ. قوتابخانەی ئۆندۆغۆ بۆ فێربوونی سەرتایی.

ب. قوتابخانەی تەکنیکی لادێ.

بەرنامەی ئەندۆغۆ بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی پرۆگرامی خوێندنی بەشێوەیەك دارێژاوە کە جیاوازە بووە لە قوتابخانەکانی ئاسایی ئەویش بە پێی ئەم بنەمایانە:

١. دەبێت وانەکانو ماوەی خوێندن لە قوتابخانەکانی ئەندۆغۆدا کورتکراوە بێت، چونکە ئەو منداڵانە دەمێکە لەسە جادەن و لەڕووی تەمەنەوە گەورەنو ناتوانن بۆ چەند ساڵێکی زۆر لەو قوتابخانە بمێننەوە.

٢. زیاتر خوێندنی وانە تەکتیکیەکان بە پلەی یەکەم دێت، بەو پێیەی کەمنداڵان لە ژیانی کارکردن بەکاری دەهێنن.

٣. خوێندنەوەو بنچینەکانی ژماردنیان فێر دەکرێن.

٤. فێرکردنی ووشیاری کۆمەڵایەتی و هەستی پەیوەست بوون بە کۆمەڵگەوە.

٥. دەبێت ناوەرۆکی ئەو بابەتەی کە دە خوێنرێت شیاو بێت بۆ جێبەجێکردن لە ژیانی ڕۆژانەیاندا.

٦. خاڵە لاوازەکانی منداڵان پەسەند بکرێتو یارمەتیان بدرێت بۆ چاندنی. بۆ چوونی ڕاست دەربارەی خۆیان.

٧. دەبێت خوێندن بەخۆڕایی بێت بۆ ئەو منداڵانەی کە ژینگەیەکی داخراوەوە هاتوون.

٨-دەبێت ئەو بابەتانەی لە بەرنامەی نەندۆغۆدا، پێشکەش دەکرێت. گونجاو بێت هەم لەگەڵ داواکارییەکانی منداڵانو هەم لەگەڵ داواکارییەکانی کۆمەڵدا.

لەبەرنامەی نەندۆغۆدا، ماوەی هەروانەیەك (٤٥) خوولەکەو زیاتر بابەتە سەردکیەکانی زانست و بازرگانی دەخوێنن. لە زانستیشدا ووزەو پەرودردەی کێڵگە (وەك، باڵندەو، کەروێشك پەروەردەی تەندروستی) دەخوێنن. لە زانستی بازرگانیدا منداڵ فێری گۆڕینەوەی پارە دەکرێت لەگەڵ کڕینو فرۆشتندا، فێری قازانجو زەرە دەبێت، جگە لەمە هەروەکو تەواوکەرێك بۆ خوێندنی تیۆری سووچێك لە شێوەی دوکانێك دا لە هۆڵی خوێندندا تەرخان دەکرێت، تا منداڵان ئەوەی فێری بوون لە بنەماکانی بازرگانی بەشێوەیەکی کرداری جێ بەجێ بکرێت، بەرنامەی ئەنۆغۆ خشتەی تایبەتی هەبوو بۆ جۆرو ژمارەی ئەو بابەتو وانانەی کە لە هەرسی قۆناغی خوێندندا دەخوێنرێت، وەکو خشتەی ژمارە (١).

**خشتەی ژمارە (١) جۆرمو ژمارمو بابەتی وانەکان .**

**پیشان دەدات لە ماوەی هەرسێ ساڵەکەدا**

| ژ | وانەکان | قۆناغی ١ | قۆناغی ٢ | قۆناغی ٣ | کـــۆ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | اللغـــة الســـواحلية (زمانە کەنارەکان) | ٩ | ٤ | ٣ | ١٦ |
| ٢ | ئیشی دەست | ٦ | ٤ | ٤ | ١٤ |
| ٣ | بیرکرای | ٥ | ٥ | ٥ | ١٥ |
| ٤ | زاست | ٥ | ٥ | ٦ | ١٦ |
| ٥ | مۆسیقا | ٤ | ٤ | ٤ | ١٢ |
| ٦ | زمانی ئینگلیزی | ٣ | ٧ | ٧ | ١٧ |
| ٧ | خوێندنـــــــــە کۆمەلایەتیەکان | ٣ | ٦ | ٦ | ١٥ |
| ٨ | فێربـــــــــوونی بازرگانی | ٣ | ٣ | ٣ | ٩ |
| ٩ | پـــــــەروەردەی جەستەیی | ٣ | ٣ | ٣ | ٩ |
| ١٠ | فێربوون | ٢ | ٢ | ٢ | ٦ |
| | | ٤٣ | ٤٣ | ٤٣ | ١٢٩ |

## تاوتوێ کردنی توێژینەوەکانی پێشوو

پاش خستنەڕووی توێژینەوەکانی پێشوو، دەتوانین ئاماژە بەوە بدەین کە زۆربەی توێژینەوەکانی ئامانجیان تیشک خستنەسەر کێشەو گرفتی قۆناغەکانی ژیانی مێرد منداڵو چاکردنی بواری ژیانیانە، کە هەریەکەیان جەخت دەکەنە سەر لایە نێك لە لایەنەکانی ژیانی مێرد منداڵ، لەگەڵ بوونی بابەتی جیاوازو نموونەی جیاواز، ئەویش بە بەراوورد لەگەڵ توێژینەوەی ئێستادا ولەبەر نەبوونی ئەم جۆرە توێژینەوانە لە کتێبخانەکانی هەرێم دا، دەتوین چەند تێبینیەك لەڕووی ئامانج و نموونەو ئامارو ئەنجامی توێژینەوەکانی بەدی بکەین.

**أ-لەڕووی ئامانجەوە**: ئامانجەکان جیاواز بوون بەم شێوەیە:

- توێژینەوەی عبدالرحیم و تەلعەت حسن: خوێندنەوەیەك بۆ گونجاندنی کەسێتیو کۆمەڵایەتی ئەو خوێندکارانەی بێ بەش بوون لە دایك لە قۆناغی سەرتایداو ئەخشەکێشانی پلانێکی دەروونی – کۆمەڵایەتی و پەروەردەی بۆ چاودێریکردنیان.

- توێژینەوەی محمد سلیمان ابراهیم البیاتی: خوێندنەوەی هەندێ لایەنی کەسێتی ئەو مێرد منداڵانەی کە باوكو دایکیان لە دەست داوە، هەروەك لە تاقیکردنەوەی ساکس دەرکەوتووە، بەبەراوورد کردنی بە کەسێتی ئەو مێرد منداڵانەی کە باوكو دایکیان لە دەست نەداوە، بە پێی ئەم گۆڕاوانە:

١ ڕەگەز (نێر، مێ).
٢ لە دەست دان (نەمان) ئەوانەی باوك و دایكیان لە دەست داوە ئەوانەی باوك و دایكیان لە دەست نەداوە.
٣ ناوێتە كردنی لەنێوان گۆڕاوی ڕەگەزوو لە دەست دان.

-توێژینەوەی ئیشكردن منداڵان لە ئەردەن:- ئامانجی سەرەكی توێژینەوەكە:
١ زانینی قەبارەی گرفتی ئیشكردنی منداڵان لە ئەردەن، بە پشت بەستن بەو زانیارییایە ڕوپێویانەی كە هەیە لەسەر هۆكارو بارودۆخ و ئەنجامی ئیشكردنی منداڵان.
٢-ڕاسپاردەو پێشنیار بۆ گرتنەبەری شێوازی پاراستن و چۆنیەتی چارەسەركردن و نەهێشتنی ئیشكردنی ترسناك و نایاسایی منداڵان.
بەڵام ئامانجە لاوەكیەكانی (لقە ئامانجەكان) ئەم توێژینەوەیە:
١ دیاریكردنی ئەو كۆمەڵە لاوەكیانەی كە زیاتر تووشی ئیشكردن دەبن لە قۆناغی منداڵی دا، وەك كەوتووی قوتابخانەكان.
٢-دیاریكردنی كەم و كورتی یاساداانانی تایەبەت بە خوێندن و هاوكاری كۆمەڵایەتی، لەوانەیە نێگەتیڤانە كاربكاتە سەر ئیشكردنی منداڵان.
٣-دیاریكردنی كەم و كورتی لە یاسای كارو كرێكار لە ئەردەن.
٤- چاو خشاندن بە بەرنامەی مەشقی پیشەیی و بەرنامەیی ئاسیستمی، كە ئامانجی توێژینەوەكە بوو لە قوتابخانە، ئەوەی تایبەتە بە ئیشكردنی منداڵانی كەوتوو لە قوتابخانەدا (ڕاسبەكان).

## -توژینەوەی ف، ك غیشورو:-

١ گونجاندنی زیانێکی ناسایی و لە بار بۆ منداڵان، تاڕابهێنرێت کە چۆن بژێن لەناو کۆمەڵدا.

٢ فێرکردنی منداڵ بۆبە دەست هێنانی سەربەخۆی خود.

٣ وا لە منداڵان بکرێت کە بە شێوەیەکی بنیاتنەر سەیری ژیان بکەن، ئەویش بە بەدەستهێنانی کەسێتی یەکی پۆزەتیڤانە.

٤ بەرنامەی ئەندۆغۆ باوەڕ بوون بە خوود دەخاتە مێشکی منداڵانەوەو یارمەتیان دەدات بۆ ڕووبەڕو بوونەوەی گرفتو ناخۆشیەکانی ژیان.

٥-دابینکردنی خوێندنی سەرتایی بۆ منداڵان سەرجادە.

بەڵام توێژینەوەی ئێستا ئامانجی بریتیە لە:-

١ هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان لە خێزانەوە بۆ سەرجادە.

٢- ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بە هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان لە خێزانەوە بۆ سەرجادە بەپێ ڕەگەزیان.

٣ ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بەهۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵان بەپێی شوێنی نیشتە جێ بوونیان.

**ب - لەڕووی نموونەی توێژینەوە:** لەم رووەشەوە جیاوازی دەبینرا:-

توێژینەوەی عبدالرحیم و تەلعەت حسن: نموونە توێژینەوە کە پێکهاتبوو لە خوێندکارانی پۆلی چوارەمی سەرتایی، (ئەوانەی کە بێ بەش بوون لە دایكو ئەوانەی بێ بەش نەبوون لە دایك)، ژمارەیان (١١٢) منداڵ

بوو نیوەی ئەو منداڵانە بوون کە بێ بەش بوون لە دایکو و نیوەکەی تریش لەو منداڵانە بوون کە بێ بەش نەبوون لە دایك، تەمەنی ئەم منداڵانە (١٠) ساڵ زیاتر نەبوو، جگە لە مە توێژەر ئەو منداڵانەی لابرد کە ڕێژەی زیرەکیان لەخوار ناوەندەوە بوو، هەروەها ئەو منداڵانەشی لابرد کە لە ئاستە باڵاکاندا بوون، ئەمەش لە پێناوی هاوسەنگی لە ڕێژەی زیرەکی هەردوو کۆمەڵەکەدا.

توێژینەوەی محمد سلیمان البیاتی دووکۆمەڵەی بەکارهێنا:-

١ کۆمەڵەی ئەو منداڵانەی کە دایكو باوکیان لە دەست داوە لە پارێزگاکانی عێراقدا، تەمەنیان لە نێوان ١٢ ١٨ ساڵدایەو ژمارەیان (٥٩) کەسەو (٤١) کوڕو (٨) کچ.

٢ کۆمەڵەی کۆنترۆڵ: توێژەر ئەم کۆمەڵەیەی هەڵبژارد، بەڕەچاوکردنی یەکسانی لەنێوان هەردوو کۆمەڵەی کۆنترۆڵو ئەزموونی بەپێی:

أ ژمارە، توێژەر (٤١) مێرد منداڵی لەکوڕو (١٨) مێرد منداڵان لە کچ هەڵبژاردووە.

ب یەکسانی تەمەن.

ج قوتابخانەو پۆلەکان، هۆبەکان، ساڵی کەوتن.

توێژینەوەی نیشکردنی منداڵان لە ئەردەن: نموونەی توێژینەوەکە، نموونەیەکی بەئامانجە، نەوەك نموونەیەکی هەڕەمەکیە، نموونەکە لە چوار ناوچەی دەرامەت نزمدا لە عمان هەڵبژاردوە ئەوانیش:

١ احیاء نزهة، الطفایلة، جبل النصر، الدبابیة.

٢ چوار كەمپی ئاوارە لە (الوحدات، البقعة، الزرقاء، غزة).
٣ چوار ناوچەی پیشەسازی وەكو (پرۆژەی كارگەو چاكردنی ئۆتۆمبیل)
٤ ناوچەی (وادی السیر- سحاب، وادی الرحم، ماركا).

هەروەها توێژینەوەی غیشوور كەبەرنامەی ئەندۆغۆی جێ بەجی كرد، بە سەرچوار قوتابخانە لە چوار ناوچەی جیاوازدا دابەش ببوو:
١ قوتابخانەی نیورغرومان لە گەرەكی نغو منغۆ.
٢ قوتلبخانەی دێی ئاتاری تەكنیكی لە دۆڵی تاتار.
٣ قوتابخانەی ئەندۆغو بۆ فێربوونی سەرتایی لە بوموانی لە بماجنغۆ.
٤ قوتابخانەی كیرا بۆ فێربوونی سەرتایی لە كیرا.
نموونەی توێژینەوەی ئێستا:- پێكهاتووە لە و مێردمندالانەی هاتونەتە خانەی مندالانی سەرجادە كوڕانو خانەی مندالانی سەرجادەی كچان لە بەرواری ٢٠٠٢/١/١ تا ٢٠٠٢/٦/٣٠ كە ژمارەیان (٨٦) مێرد مندال بوو (٦٠) مێرد مندالی كوڕو (٢٦) مێرد مندالی كچ.
**ج-لە ڕووی ئامرازی توێژینەوە:-** دەتوانین بڵێین جیاوازیش لەم ڕوانگەوە هەبوو لە توێژینەوەی عبدالرحیم و تەلعەت حسن دا، توێژەر ئەم ئامرازانەی بەكارهێناوە: ١- تاقیكردنەوەی وێنەیی بۆ زیرەكی.
٢ فۆرمی باری كۆمەڵایەتی.

٣ تاقیکردنـــەوەی کەســـێتی منـــدالان. ٤ ئـــامرازی سوســـێومیتری بـــۆ پێوانەکردنی کۆمەلایەتی ئەو پەیوەندییە کۆمەلایەتیەی کە هەیە لەنێوان ئەو مندالانەی بێ بەش بوون لە دایك و ئەوانەی بێ بەش نەبوون لە دایك.

بەلام توێژینەوەی محمد سلێمان البیاتی، ئامرازی تەواو کردنی ڕستەیبەکارهێناوە، ، کەهی (جۆزیف ساکس)ەو تاقی کردنەوەکەی بە شێوەی کۆمەلّ جێ بەجێ کردووە.

لە توێژینـەوەی ئیشـکردنی منـدالان لـە ئـەردەن، توێـژەر ئـەم ئامرازانـەی بەکارهێناوە :

١ فۆرم، وە سێ جۆر فۆرمی بەکارهێنا: بۆ مندالە ئیشکەرەکان، بۆ دایکی مندالەکان، بۆ ئەوانەی کەمندالەکان بەکار دەهێنن.

٢ چاو پێکەوتن. کە پرسیارێکی کـراوەی ئاراسـتەی ئـیش کـەرانی وەزارەت، ڕێکخـراوە حکـومیو ناحکومیـەکان، یـەکێتی کرێکـاڕانو ئەوانـەی منـدالّ دەپارێزێ هەروەها پسپۆڕان لەو بوارەداکرد. ..

٣ ئـامرازی تێبینـی بـەکارهێناوە (الملاحظـة) بـۆ کۆکردنـەوەی زانیـاری، دەربارەی چۆنیەتی ئیشکردن و بارودۆخی مندالان.

بەلام لە توێژینەوەی غیشووردا ئامراز بە کار نەهات، بـەلکو: بەرنامـەی ئەنرۆغۆ بەرنامەیەکی پەروەردەیی جێ بەجێ کردن بوو.

ئامرازی توێژینەوەی ئێستا (فۆرمە) توێـژەر لـە دراسـەیەکی استطلاعیـەوە دەستی کەوتووە کەبەسەر کۆمەلێك لەو بەخێوکەری مێـرد مندالانـەی کـە

هاتبوونە خانەی کوڕان‌و خانەی کچان ئەنجامدرا هەروەها توێژەر سوود ی‌لە چەند سەرچاوەیەکی تریش وەرگرتووە بۆ بەدەست کەوتنی دەستەواژەکان

د-لە ڕووی ئامازە ئامارییەکانەوە: سەبارەت بە توێژینەوەی عبدالرحیم و تەلعەت حسن ئامرازی (T. Test) یان بەکارهێنانی بۆ شیکردنەوەی جیاوازی لە نیوان منداڵانی بێ بەش بوو لە دایك و منداڵانی بێ بەش نەبوو لە دایك.

توێژینەوەی محمد سلێمان البیاتی، ئەم ئامرازە ئامارییانەی بەکارهێنا:

١ ناوەندی ژمارەی و لادان پێوانەی.

٢ هاو کۆلکەی پەیوەست بوونی پیرسون.

٣ شیکردنەوەی جیاوازی.

هەروەها لە توێژینەوەی ئیشکردنی منداڵان لە ئەردەندا، ئەم ئامرازە ئامارییانە بەکارهێنرا بۆ شیکردنەوەی زانیارییەکان:

١ ئاماری (وصفی) و شیکردنەوەی وەك (ڕێژەی سەدی، دووبارە بوونەوە).

٢ (الرزمە الاحصائیة ) بۆ زانستە کۆمەڵاتیەکان. (sPSS) Statistical Packoye for soual Science.

سەبارەت بە توێژینەوەی غیشۆرو ئەمە توێژینەوەیەکی (بەرنامەیەکی) پەروەردەیی جێبەجێکردن بوو ئامرازی ئاماری تیادا بەکار نەهات.

لە توێژینەوەی ئێستادا ئەم ئامرازە ئامارییانە بەکار هاتن: (ناوەندی ژمارەی، هاو کۆلکەی پەیوەست بیرسۆن، هاوکێشەی فیشەر، دووچای کای)

**هـئـەنجام**: توێژینـەوەكانی پێشوو، جیـاواز بـوون لـە ڕووی ئەنجامـەوە كـە هەموویان لە سەرەیك ئەنجام كۆك نەبوون.

## بواری تیۆری توێژینەوەكە

مندالآنی سەرجادە، یاخود منـدالآنی پەرتـەوازە، یەكێكـە لـەو گرفتانـەی كـە زۆربـەی وولآتـانی جیهـانی گرتۆتـەوە، هـەر لـە وولآتـە سـەرمایەدارو پێشكەوتودكانـەوە، تاكو دەگاتە وولآتەهـەژارەكانیجیهانی سێ هـەم، منـدالّ بە شێكە لە كۆمەلّو تۆوی بنیاتنانی كۆمەلّـی شارسـتانیە، منـدالّیش وەكـو هەموو چینوو توێژەكانی تری كۆمەلّ تووشی گرفت دەبێت.

لـــە ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانەكاندا هاتووە، كە مندالآنی سەرجادە بە زۆربەی شارە گەورەو بچووكەكانی جیهاندا بلآو بـوو نەتـەوە، كەلـە بـەر ناخۆشـیو بارو دۆخی ژیان فڕی دراونـەتە سەر شەقامەكان بۆ بۆ ژیان بردنـە سەر لـەو شێونەدا (أبو خالد، ٢٠٠٢ لە ئەنتەرنێتەوە).

مێرد مندالآنی سەرجادە، ئەوانـەن كە بـەهۆی ناخۆشـی ژیانـەوە؛ یـاخود بـوونی گرفـت لـەناو ئـەو ژینگەیـەی كـە تیایـدا دەژیـتو. پەیوەنـدیان بـە كەسـووكاریانەوە نامێنێـت، واتـە دادەبڕێـت لـە خێزانـەكانیان، یـاخود بەشێوەیەكی كەم پەیوەندیان دەمێنێت و زۆر كـەم یـەكتری دەبیـنن لەگـەلّ خێزانەكانیادا ئەویش بەهۆی مانـەوەی ئـەو مێـرد مندالآنـە لـە سـەر جـادە بۆماوەیەكی زۆر.

یەكـەم جـار كـە ووشـەی منـدالآنی سـارجادە لەلایـەن ڕۆژنامەوانـە ڕۆژ ئاواییەكانـەوە بەكارهێنـرا لـە سـالآنی هەشـتاكاندا، منـدالآنی سـەرجادە بـەو

کۆمەڵە منداڵانە دەوترا کەلەسەرجادە دەژین وهەن، ئەوەك بەشێوەی تاك تاك، هەروەها بە ئەو منداڵانەی کە دایكو باوکیان لە دەست داوە، یان جیابوونەتەوە، یان بەهۆی هەژاری، یان بوونی ئاژاوەی بەردەوام لەناو خێزاندا رایان کردووە، بۆ بەردەوام بوونی ژیانی لە سەر جادە ئەوانە پێیان دەوترێت منداڵانی سەرجادە (ولکاس، ۲۰۰۱ لە ئینتەرنێتەوە).

بەهۆی نەبوونی یارمەتی پێویست و بەهۆی نەدۆزینەوەی هۆکارە سەرکیەکانی راکردنی مێرد منداڵان بۆ سەرجادە و بنەبڕکردنی ئەو هۆکارانە بەتەواوەتی کێشەی منداڵان سەرجادە لە زۆربووندایە، وە ئەو مێردمنداڵانە لە شوێنە جیاجیاکانی ناو شاردا نیشتەجێنو ژیان دەبەنە سەر.

منداڵانی سەرجادە بۆ ئەوەی ژیانی خۆیانی دەستەبەربکات لە سەرجادە، پێویستە بچێت ئە لای یەکێك لەو کۆمەڵە منداڵانەی کە هەیە لە سەرجادە، واتە ببیتە یەکێك لەو کۆمەڵە منداڵانە، دکتۆر فۆن دکر دەڵێ ((ئەم منداڵانە توانایەکی زۆر لەرادە بەدەریان هەیە کە جێی سەرسوڕمانە کە لە دەمارگیری کۆمەڵەکەیەوە بەردەگرێت، ئەو منداڵانەی ئامادەن کە ئەوەی هەیانە بەشی بکەن لەنێوان خۆیاندا، هەروەها ئامادەن ژیانی خۆیان بەخت بکەن لەپێناوی هاورێکانیاندا (ولکاست، ۲۰۰۱، لە ئەنتەرنێتەوە).

ئەم منداڵانە ژیانیان بە جەند شێوەیەك دەبەنە سەر، وەکو سواڵ کردن، پاکردنەوەی شووشەی سەیارە لە گەراجو شۆستەکاندا، قۆنەرە بۆیاخ کردن، فرۆشتنی خواردەمەنی لە سەر رێگا کان، هەروەها دزی کردن، یان فرۆشتنی لە شیان، یان چەند کارێکی تر وەکو ئامێرێك یاخود

ئامرازێك بەكاریان دەهێنن بۆ گواستنەوەی مادده بێ هۆش كەرەكان (المخدرات) بەناو بازارەكاندا.

بەهۆی بوونی ئەم منداڵانە بۆ ماوەیەكی زۆر لە سەرجادەو مانەوەیان لە سەر ژیان بەو شێوەیە، منداڵان داب و نەریتە كۆمەڵایەتیەكان لە دەست دەدەن، چونكە منداڵان لە سەر جادەكان و شوێنە گشتیەكان تێكەڵاوی زۆر چین و توێژی كۆمەڵ دەبن، لەوانەیە ئەو كەسانەی كە تێكەڵاوی دەبن لایان دابێت لەكۆمەڵ و داب و نەریتەكانی، یاخود تاوانبار بن لەلایەن یاساوە، هەروەها ئەو منداڵانەی دادەنرێت بە ماددەیەكی (خاو) سەرەتایە بۆ تاوان و بڵاو بوونەوەی مادده بێ هۆشكەرەكان بەدرەوشتی. (ابو خالد، ٢٠٠٢، لە ئەنتەرنێتەوە).

مێرد منداڵان بۆ پەیدا كردنی پێویستیە سەرتاییەكانی ژیانیان زۆر جار پەنا بۆ كاری نایاسایی دەبەن كە سەرتایە بۆ فێربوونی تاوان، چونكە لە رێگەی ئیش كردنی خۆیەوە دەستی ناكەوێت، بۆیە هەوڵدەدات بە رێگەی تر پەیدای بكات.

زۆرجار منداڵانی سەرجادە لەلایەن هێزە كۆمەڵایەتیەكان و هێزە میللیشیاكانی ناو شارەوە بەكار دەهێنرێن، بۆ كاری تایبەتی خۆیان، یان بۆ پاكردنەوەی شەقامەكان، پاشان كە كاریان پێیان نەما دەیان كوژن و فرێیان دەدەنە ناو زێراب و زبڵەكانی قەراغ شار (ابو خالد، ٢٠٠٢ لە ئەنتەرنێتەوە).

لە كیشوەری ئەفەریقیا، بە شێوەیەكی چڕ منداڵانی سەرجادە هەیە، بەتایبەتی لەو وڵاتانەی كە كێشەی ناو خۆی تیادا هەیە، هەروەها ئەو وڵاتانەی كە لە رووی ئابوورییەوە ئاستێكی نزمیان هەیەو كەم دەرامەتن،

قاچاخچیه بازرگانیەکان بازرگانی بەو منداڵانە وه دەکەن، ئەویش بەمەبەستی بەدەست کەوتنی پارەیەکی زۆر له بری ئەو منداڵانەی کە لە شەقامەکاندا بۆ جێگەو خواردن دەسورێنەوه (غانا، ٢٠٠٢ لە ئەنتەرنێتەوه).

بە پێی ئاماری نەتەوه یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٩٤ (٨٠) ملیۆن منداڵی سەرجادە هەیە لەهەموو جیهاندا، نیوەی ئەم منداڵانە لە ئەمەریکای لاتینیدا دەژین، و نیوەکەی تریشی بەسەر هەموو جیهاندا دابەش بوون، بڕوانە نەخشەی (٢) (ولکاس، ٢٠٠٢لەئەنتەرنێتەوە)

کە هەڵسوکەوتی ئەم مێرد منداڵانە بە شێوەیەکی گشتی دژ بە کۆمەڵە، چونکە ئەو رێگایانەی کە دەیگرنە بەر بۆ پەیدا کردنی پێویستیەکانی ژیانیان دەبێتە هۆی مایەی بێزاری کەسانی چواردەوری.

لەووڵاتی مەکسیك و بەتایبەتی پایتەختەکەی کە مەکسیکۆ سیتی نزیکەی (٢٠،٠٠٠) هەزار منداڵی سەرجادە هەیە و خەڵکی مەکسیکۆ سیتی دەڵێن ئەم منداڵانە نەخۆشی شێرپەنجەن دەبێ لەناو ببرێت. هەروەها دەڵێن ئەوانە تاوان دەکەن و پێویست بە هاوکاری کردنیان ناکات (فیلم مکسیکی، ٢٠٠٢، لە ئینتەرنێتەوه).

منداڵانی سەرجادە، بەو شێوەیە دەرناکەوت کە ئێمە دەیان بینین، واتە تەنها لە ڕووی ڕووخسارەوه هیلاك و ماندوو بێ جلو بەرگ و پاك و تەمیز نین، بەڵکو ئەو منداڵانە بەشێوەیەکی دارماو بێ هێز دەردەکەون لەڕووی دەرونیەوەو لە ژێر هێڵی ویژدانی مرۆڤایەتیدان (ابوخالد، ٢٠٠٢، لە ئەنتەرنێتەوه).

## نەخشەی ژمارە ( ٢ )

## دابەشبوونی منداڵانی سەرجادە لە جیهاندا

| ژ | ناوی وڵات | ناوی شارەکە | ژمارەی منداڵانی سەرجادە |
|---|---|---|---|
| ١ | مصر | قاهرە | ١,٥٠٠,٠٠٠ |
| ٢ | مالی | | ١٥,٠٠٠ |
| ٣ | ئۆغندا | کمبالا | ٥,٠٠٠ |
| ٤ | السنغال | | ٤٠٠,٠٠٠ |
| ٥ | کینیا | نیروبی | ٤٠,٠٠٠ |
| ٦ | تنزانیا | دار السلام | ١[illegible]٠٠ |
| ٧ | نیجیریا | ماغزی | ٥٠,٠٠٠ |
| ٨ | غرب افریقیا | | ٢٠٠,٠٠٠ |
| ٩ | مکسیك | مکسیکۆ سیتی | ٢٠,٠٠٠ |
| ١٠ | اثیوبیا | بۆکاغۆ | ١٠٠,٠٠٠ |
| ١١ | رواندا | | ٧,٠٠٠ |
| ١٢ | جمهوریة کونغو الدیمقراطیة | | ١٠,٠٠٠ |

# بەشی سێهەم

## پرۆگرامی توێژینەوەکە

(منهجية البحث)

١ نموونەی توێژینەوەکە.

٢-ئامرازی توێژینەوەکە.

٣-کرداری توێژینەوەکە.

### ١- نموونەی توێژینەوەکە :

لــــە پێنـاوی خستنەڕووی شێوازێکی ئاشکرا سـەبارەت بـە چۆنیەتی هەڵبـــژاردنی نموونـــەی توێژینەوەکـــە، بـــۆ ئـــەوەی ببێتـــە نوێنـــەری، ڕاستەقینەی کۆمەڵـەی بنچـینەیی، کـە لێـوەی هەڵبـژێردراوە، پێویسـتە ئاماژە بەو کۆمەڵە بدرێت، لەم پێناوەش دا، پاش دەستکەوتنی ناو شـوێنی نیشتەجێی بـوونی ئـەو مێـرد منداڵانـەی کـە هاتوونەتـە خانـەی منـداڵانی، سـەرجادەی کـوڕان و خانـەی منـداڵانی سـەرجادەی کچـان، دەرکـەوت کـە

ژمارەی هەموو ئەو مێرد منداڵانە (٨٦) مێرد منداڵ بوون، ئەوانەش (٦٠) مێرد منداڵی کوڕو (٢٦) مێرد منداڵی کچ، هەمو ئەم ژمارەیەش لە بەرواری ٢٠٠٢/١/١، تاکو ٣٠/ ٦/ ٢٠٠٢ هاتوونەتە خانەی منداڵانی سەرجادەی کوڕانو خانەی منداڵانی سەرجادەی کچان، ئەم ژمارەیەش بە سەر چەند ناوچەیەکی جیا جیادا دابەش بوون، بڕوانە نەخشەی ژمارە (٣).

دوای دیاری کردنی ژمارەی مێرد منداڵانی هەردوو خانەی منداڵانی سەرجادە کوڕانو کچان کە کۆمەڵا بنچینەی توێژینەوەکەیە، توێژەرو هەموو مێرد منداڵەکانی هەردوو خانەکەی وەرگرتووە، ئەوانەی کە لە بەرواری ٢٠٠٢/١/١ تاکو ٢٠٠٢/٦/٣٠ هاتوونەتە خانەی منداڵانی سەرجادەی کوڕانو خانەی منداڵانی سەرجادەی کچان، کە ژمارەیان (٨٦) مێرد منداڵە، (٦٠) یان کوڕەو (٢٦ )کچە، بەڵام ئەو مێرد منداڵانەی کە توانرا پەیوەندی یان پێوە بکرێت بۆ جێ بەجێ کردنی توێژینەوەکە کە، لەهەردوو خانەکەدا بوون، ژمارەیان (٧٢) مێرد منداڵە، لەوانە (٥٢) مێرد منداڵی کوڕو (٢٠) مێرد منداڵی کچە، بڕوانە نەخشەی ژمارە (٤).

بەڵام (١٤) لەو مێرد منداڵانە نەتوانرا پەیوەندیان پێوە بکرێت، لەبەر ئەوەی هەندێکیانم لەسەر سنورەکان نیشتەجێ بوونو هەندێکی،تریان لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەریمدا نەبوون.

## نەخشەی ژمارە ٢

شێوازی نیشتەجێ بوونو ژمارەی مێرد منداڵانی هەردوو خانەی منداڵانی سەرجادەی کوڕانو کچان

| ژ | ناوی شوێن | ژ. کوڕ | ژ. کچ | کۆی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | سلێمانی | ١٣ | ٨ | ٢١ |
| ٢ | وولوبە | ٢ | | ٠٢ |
| ٣ | کەمپی سەلام | ٢ | | ٠٢ |
| ٤ | بەکرە جۆ | ٣ | - | ٠٣ |
| ٥ | ئاومبارە | ١ | ١ | ٠٢ |
| ٦ | بازیان | - | ١ | ٠١ |
| ٧ | زەرایەن | ١ | - | ٠١ |
| ٨ | سید صادق | ٣ | - | ٠٣ |
| ٩ | حاجیاوا | - | ٢ | ٠٢ |
| ١٠ | هەڵەبجـــەی شەهید | ٢ | ١ | ٠٣ |
| ١١ | کەرکوك | ٤ | ٢ | ٠٦ |
| ١٢ | هەولێر | ١١ | - | ١١ |
| ١٣ | ماوەت | ١ | | ٠١ |
| ١٤ | عەربەت | ٢ | - | ٠٢ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٥ | دەربەندیخان | ٣ | ١ | ٠٤ |
| ١٦ | ئیران | ٤ | ٣ | ٠٧ |
| ١٧ | چەمچەماڵ | ٣ | | ٠٣ |
| ١٨ | بغداد | ١ | | ٠١ |
| ١٩ | بێ لانە | ١ | - | ٠١ |
| ٢٠ | قەڵادزێ | ٢ | ١ | ٠٣ |
| ٢١ | پێنجوێن | | ١ | ٠١ |
| ٢٢ | تەکیە | - | ٤ | ٠٤ |
| ٢٣ | کانی وەیسە | | ١ | ٠١ |
| | | ٦٠ | ٢٦ | ٨٦ |

**نەخشەی ژمارە (٤)**

**نموونەی توێژینەوەکە وڕێژەی سەدییەکەی**

| ڕەگەز نموونەی توێژینەوەکە | کوڕ/ نێر | کچ/ مێ | کۆی |
|---|---|---|---|
| کۆمەڵـــــەی بنچـــــینەی تنوێژینەوەکە | ٦٠ | ٢٦ | ٨٦ |
| نموونەی توێژینەوەکە | ٥٢ | ٢٠ | ٧٢ |
| ڕێـــژەی ســـەدی نموونـــەی توێژینەوەکە | ٧٢,٢٢ | ٢٧,٧٧ | ١٠٠ |

## ٢-ئامرازی توێژینەوەکە:

بـــــەمەبەستی جێبەجێکردنی توێژینەوەکە لە سەر نمونەی دیـاری کـراو، توێـژەر هەسـتا بـە ئامـادە کردنـی فـۆرمی راپرسـی (استـبيان) کـە بریتیە لە (کۆمەڵێك پرسیار لەلایەن توێژەرەوە ئامادە دەکرێت، (مبحـوپ) هەڵدەستی بەوەڵامدانەوەی بەبی هاوکاری توێژەر) (حسن، ١٩٨٢، لا٢٢٥).
بەڵام نەتوانرا ئەم شێوازە لـە سـەر هەنـدێك لـە ئەنـدامانی نموونەکـە جێ بـەجێ بکرێـت، چـونکە خوێنـدەواریان نـەبوو، بۆیـە توێـژەر ناچـار بـوو شـێوازێکی تـر لـە وەڵامـدا نـەوەی فـۆرم بـەکار بهێنێـت کـە پێـی دەڵـێن (Schodule)، توێژەر خۆی هەڵدەستێ بە پڕکردنەوەی فۆرمەکە لـەکاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ (مبحوث)دا (حسن، ١٩٨٢، لا٢٢٥).
هـەروەك دەزانـین کـە ئـامرازی توێژینــەوەو شـێوازەکانی دەگۆرێـت لـە توێژینەوەیەکەوە بۆ یەکێکی تر، لە پێناوی گەیشتن بـە ئامـانجی دروسـتی توێژینەوەکــەی، ئامــانجی توێژینـــەوە بــەپێی سروشــتی توێژینـــەوەو پێویستیەکەی دیاری دەکرێت، هەر بۆیە ئامانجی ئەم توێژینەوەیە زانینـی (هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرد منداڵانە لە خێزانەوە بـۆ سـەرجادە)، توێـژەر هەسـتا بـە بنیاتنـانو ئامـادەکردنی دەسـتە واژەکـان لـە ڕێگـەی (دراسـة الأستطلاعية)وە، ئەمەش لەبەر نەبوونی پێوەرێکی ئامادە کراو بوو بۆ ئەم

توێژینەوەیە، ئەم (دراسة أستطلاعية)ە جێبەجێکرا لە سەر کۆمەڵێك لە بەخێوکەری ئەو مێردمنداڵانەی هاتوونەتە خانەی منداڵانی سەرجادەی کوڕانو خانەی منداڵانی سەرجادەی کچانو بە ڕێگەی هەرەمەکی (عشوائی) هەڵبژێردران، ژمارەیان (٢٠) بەخێوکەر بوو (١٠) لە بەخێوکەری مێرد منداڵانی کوڕانو (١٠) لە بەخێو کەری مێرد منداڵانی کچان، کە توێژەر تیایدا پرسیارێکی کراوەی ئاراستەی ئەو بەخێوکەرانە کردووە، پاشکۆی ژمارە (١)

پاش کۆ کردنەوەی وەلامی پرسیارە کراوەکە، توێژەر هەستا بە ناوێتە کردنی دەستە واژە لێك چووەکانو جیاکردنەوەی زانیارییەکانی ناو فۆڕمەکان، جگە لەمە توێژەر سوودی لە چەند سەرچاوەیەکی تریش وەرگرتووە بۆ داڕشتنی دەستەواژەکانو توانرا (٢٧) دەستە واژە ئامادە بکرێت، پاشکۆی ژمارە (٢) سەبارەت بە (بدائل)ی دەستەواژەکان سێ (بدائل) بوو (بەڵێ، تا ئاستێك، نەخێر)، توێژەر پێوەرەکەی سست کردەوە (دوونمرە دایە بەڵێ)و (یەك نمرەی دایە تا ئاستێك) و، (صفری دایە نەخێر)، (پاشکۆی ٥).

## ٢-كرداری توێژینەوەکە (اجرأت البحث):

أ-ڕاست و دروستی دەستەواژەکان (صدق العبارة):-

ڕاستو دروستی بەمەرجێکی پێویست و گرنگ دادەنرێت، کە دەبێت لە ئامرازی توێژینەوەدا هەبێت ئەمەش ئەنجامدراوە پاش ئەوەی کە توێژەر فۆرمی دەستەواژەکانی ئامادە کردو ڕیزبەندی دەستە واژەکانی ڕێکخست و هەستا بە دابەشکردنی دەستەواژەی فۆڕمەکان بەسەر لیژنەیەك لە شارەزایانو پسپۆڕانی بواری دەروونناسیو زانستی کۆمەڵایەتیو مرۆڤایەتیو پسپۆڕانی زمانەوانی لە زانکۆی سلێمانیوهەندێ لایەنی پەیوەندیداری دیکە (پاشکۆی ٣).

دوای کۆکردنەوەی فۆڕمەکان، دەرکەوت کە زۆربەی تێبینیەکانی پسپۆڕان و شارەزاییان دروستی دەستەواژەکانیان دەرخستووە، کە توێژەر لە (دراستة استطلاعیة)وە دەری هێناوە، ئەنجامی تێبینی پسپۆڕان و شارەزایانی ئەوە بوو کە دەستەواژەی (١٠، ١٣، ٢٧)لابران و هەردوو دەستەواژەی ژمارە (٢، ٧) لێکدران، لەبەر ئەوەی هەمان مانایان دەبەخشی، جگە لە مەدەستەواژەی ژمارە (٢٤، ٢٥، ٢٦) زیاد کران، ڕێکخستنی دەستەواژەکان لە ڕووی زمانەوانیەوە ئەنجامدرا، بەمەش ڕاستیو دروستی دەستە واژەکان ڕێژەی (٨٢٪) بەدەست هێنا کە ئەم ڕێژەیەش لە سەر دروستی دەستەواژەکان

ڕێژەیەكی بەرزەو دەتوانرێت پشتی، پێ ببەسترێت، ئەم شێوازەش بە (صدقی ظاهري) ناو دەبرێت، (پاشكۆی ٤).

## ب-جێگری ئامرازەكە (ثبات الأداة):

بۆ دەرهێنانی نەگۆڕی ئامرازەكە توێژەر ڕێگەی دووبارە كردنەوەی ئەزموونی (أعادة أختيار)ی بەكارهێناوە، كە بریتیە لە دەرهێنانی هاوكۆلكەی پەیوەست لەنێوان نمرەی تاقی كردنەوەی یەكەمو نمرەی تاقی كردنەوەی دووەم لە سەر هەمان كۆمەڵەی یەكەم (حەمەصالح، ١٩٩٠، لا).

پاشان نەگۆڕی ئامرازەكە جێ بەجێكرا لە سەر نموونەیەك كە ژمارەیان (٢٠) بوو، لەوانەش (١٠) بەخێو كەری مێرد منداڵ كوڕو (١٠) بەخێوكەری مێرد منداڵی كچ، پاش تێپەڕبوونی دوو هەفتە بەسەر تاقیكردنەوەی یەكەمدا، تاقیكردنەوەی دووەم لەسەر هەمان نموونەی یەكەم، (١٠) بەخێو كەری مێرد منداڵ كوڕو (١٠) بەخێوكەری مێرد منداڵی كچ ئەنجامدرا، دواتر بەهۆی هاوكۆلكەی پەیوەستی پیرسونە وە، ڕێژەكەی دەرهێنراوە كەبریتی بوو (٠,٨٠) ئەم ڕێژەیەش ڕێژەیەكی بەرزەو دەتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت.

### ج-جێبەجێکردنی کۆتایی فۆرم: (فۆرمی کۆتایی):

پـــاش دڵنیـا بـوون لـە (ڕاسـت و دروسـتی) و (جـێگیری ئامرازەکـە)، توێـژەر هەسـتا بـە جـێ بـەجێکردنی لـە سـەر نموونـەی توێژینەوەکـە، کـە پێکهاتبوو لـە ڕێنمـایی تایبـەت بـە ئامـانجی توێژینەوەکـەو چۆنیەتی وەڵام دانەوەی دەستەواژەکان، (٧٢) فۆرم دابەش کران بـە سـەر بەخێوکـەری ئـەو مێرد منداڵانەی کە هاتوونەتە خانەی منداڵانی سەرجادەی کوڕان و خانـەی منـداڵانی سـەرجادەی کچـان، لـەماوەی یـەك مـانگـدا (فۆرمـەکان دابەشـکراو کۆکرایەوە لە١/ ٩/ ٢٠٠٢ تا ١/ ١٠/ ٢٠٠٢، وە هەر (٧٢) فۆرمەکە کۆکرایەوە، بۆ بەگەیانـدنی ئامـانجی توێژینەوەکـە توێـژەر داوای وەڵامدانـەوەی هـەموو دەستەواژەکانی کرد لە گەڵ نوسینی شوێنی نیشتەجێ بوونو ڕەگەزی مێرد منداڵەکە (پاشکۆی ٥).

### د-ئامرازە ئامارییەکان:

توێژەر ئەم ئامرازە ئامارییانەی بەکارهێناوە:

١-ناوەنـــدی ژمـــارە بـــۆ دەرهێنـــانی (ڕاســـتو دروســـتی) دەســـتەواژەکان (ئامرازەکە).

٢-هاوکۆلکـەی پەیوەسـتی( پیرسـۆن) بـۆ دەرهێنـانی (جـێگیری ئامرازەکـە) (ثباه لاداه).

٣-هاوکێشەی فیشەر بۆ دەرهێنانی، ئامانجی یەکەم هۆکارەکانی ڕاگردنی مێرد منداڵان لە خێزانەوە بۆ سەرجادە.

٤-هاوکێشەی دووجا کای (مربع کای) بۆ دەرهێنانی، ئامانجی دووەم (جیاوازی لە نێوان ڕەگەزی نێرو می دا سەبارەت بە هۆکارەکانی راکردنیان) هەروەها ئامانجی سێ هەم (جیاوازی لە نێوان شوێنی‌نیشتە جێ بونیان سەبارەت بە هۆکارەکانی ڕاکردنیان).

وە شێوەی ئامارییەکانیان بەم شێوەیە یە:-

١-ناوەندی ژمارەی

$$\bar{س} = \frac{\text{مج ك س}}{\text{ر ك}}$$

٢-هاوکۆلکەی پەیوەستی پیرسن

$$ر = \frac{\text{ن مج س ص} - (\text{مج س})(\text{مج ص})}{\sqrt{\{\text{ن مج س}^2 - (\text{مج س})^2\}\{\text{ن مج ص}^2 - (\text{مج ص})^2\}}}$$

٣-هاوکێشەی فیشەر:-

$$\text{فیشەر} = \frac{\text{ت}1 \times 2 + \text{ت}2 \times 1 + \text{ت}3 \times \text{صفر}}{\text{ن}}$$

٤-هاوکێشەی دووجای کای (مربع کای):-

$$\text{مربع کای } X^2 = \text{مج } \frac{(\text{ل} - \text{ق})^2}{\text{ق}}$$

# بەشــی چــــوارەم

## خستنەرووی
## ئـاکـامــەکـــان و گفــــتوگـــۆکـــانیان

ئـەم بەشـە تایبەتـە بـە دەرخسـتنو شـیکردنەوەی ئەنجامـەکان ئـەو ئامانجە دیاری کراوانەی، کە لە توێژینەوەکـە دا ئامـاژەی پـێ دراوە توێـژەر لە ڕێی ئامرازە ئاماریە زانستییەکانەوە پێی گەیشتووە.

**ا-دەرخستنی ئەنجامەکان:-**

بۆجێبەجێکردنی ئاماجی یەکەم، (هۆکارەکـانی ڕاکردنـی مێـرد منـدالآن لـە خێزانەوە بۆ سەرجادە بـۆ هـەردوو ڕەگـەز)، لـە ئەنجامەکـەدا دەرکـەوت کـە بـەهێزتـریین و بـەرزتـررین نمـرە دەسـتەواژەی (٢١) (تێـر نـەکردنی حـەزوو ئارەزووەکـــانی مێـــرد منـــدالّ)بـــە دەســـتی هێنـــاوە بـــە هێـــزی (١،٤٧)، ئەم نمرە بەس بە هاوکێشەی (فیشەر) بۆ دەرهێنـانی ( هێـزی دەسـتەواژە ) بە دەست هاتوە، بەم پێیە پلەی یەکەمی بەدەست هێناوەن، بـەلآم کـەمترین نمرە دەستەواژەی (١٤)، (بە هۆی جیاوازی ڕەگەزیەتیەوە)، بەدەسـتی هێنـاوە

بەهێزی ( ٠، ٥)، بەم پێیە پلەی (٢٤) بەدەست هێناوە وەك خشتەی ژمارە (٥) .

## خشتەی ژمارە (٥)

## دەرخستنی ئامانجی یەکەم و ڕیزبەندی دەستەواژەکان بە پێی پلەکانیان

| ژ | پلەی دەستەواژە | دەستەواژەکان | ڕیز بەندی لە فۆرمدا | هێزی دەستەواژە |
|---|---|---|---|---|
| ١- | ١ | تێرنەکردنی حەزو ئارەزووەکانی مێردمندالْ | ٢١ | ١.٤٧ |
| ٢- | ٢ | هەژاری و کەم دەرامەتی | ٣ | ١.٤٤ |
| ٣ | ٣ | تێنەگەیشتن لەمێرمندالأن و قۆناغەکانی ژیانیان | ٢٠ | ١.٤٢ |
| ٤ | ٤ | هەست نەکەیت نەمانی (باوك. دایك) هۆکارێك بێت | ١ | ١.٣٩ |
| ٥ | ٤ | بونی هاوڕێی خراپ | ٧ | ١.٣٩ |
| ٦ | ٥ | بلأوبونەوەیخراپی لەناو کۆمەڵگادا | ١٥ | ١.٣٨ |
| ٧ | ٦ | نەبونیشارەزاییدایك لەپەروەردەیی دروستی مێرمندالأن | ٢٥ | ١.٣٦ |
| ٨ | ٧ | عینادە بەقسەی کەس ناکات | ١٢ | ١.٢٦ |
| ٩ | ٨ | بەهۆی توندوتیژی خێزانەوە | ٢ | ١.٢٤ |
| ١٠ | ٩ | ترسان لەسزای ئەو هەڵەیەی کەکردویەتی | ٤ | ١.١٥ |
| ١١ | ١٠ | بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزانەوە | ٢٤ | ١.١١ |
| ١٢ | ١١ | نەبونیسەرپەرشتی لەناو خێزاندا | ٦ | ١.١ |
| ١٣ | ١٢ | توشی بەربەرەکانیدەرونی بووە | ١٧ | ١ |
| ١٤ | ١٣ | نازیزۆری دراوتیفەراموش کراوە لەلایەن خێزانەوە | ١١ | ٠.٨٥ |
| ١٥ | ١٣ | فەراموش کراوە لەلایەن خێزانەوە | ١٨ | ٠,٨٥ |
| ١٦ | ١٤ | بونی ئاژاوە لەناو خێزان دا | ١٩ | ٠,٨٣ |
| ١٧ | ١٥ | داوای شتیکردووە بۆی جیبەجی نەکراوە | ٩ | ٠,٨٢ |

| ژ | پلەی دەستەواژە | دەستەواژەکان | ریزبەندی لە فۆرمدا | هێزی دەستەواژە |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | ١٦ | قورس کردنیباری سەرشانی مێرمندالْ بەئیش کردن | ٢٣ | ٠.٧٥ |
| ١٩ | ١٧ | سەرکەوت و نەبوو لەقوتابخانەدا | ١٦ | ٠.٦٤ |
| ٢٠ | ١٨ | جیاوازی کراوە لەگەڵ ئەندامانی تری خێزانەکەی | ٢٦ | ٠.٦١ |
| ٢١ | ١٩ | خۆی لە ئیش کردن دزیوەتەوە | ١٠ | ٠.٦٠ |
| ٢٢ | ٢٠ | خۆی لەقوتابخانە دزی وەتەوە | ٢٢ | ٠.٥٤ |
| ٢٣ | ٢١ | هیچ گرفتێکی نیە | ٥ | ٠.٣٨ |
| ٢٤ | ٢٢ | بەهۆی ناتەواوی ژێرییەوە | ١٣ | ٠.٣٣ |
| ٢٥ | ٢٣ | دەستی پیسە (فێری دزی بووە) | ٨ | ٠.٢٩ |
| ٢٦ | ٢٤ | بەهۆی جیاوازی چینایەتیەوە | ١٤ | ٠.٥ |

بۆ جێبەجێکردنی ئامانجی دووەم، (ئایا جیاوازی هەیە لەنێوان ڕەگەزی نێرو مێ دا، دەربارەی هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرمندالآن لەخێزانەوە بۆ سەرجادە)توێژەر هەستا بەبەکارهێنانی(دووجای کای، مربع کای)کەتایبەتە بەدەرخستنی جیاوازیەکان، بەئاستی نیشان دانی(مستوى الدلالة)

(٠، ٠٥)وژمارەی سەربەستی(درجة الحرية) (٢)، بەم پێیە لەئەنجامەکەدا دەرکەوت کەدەستەواژەی(٢٣) (قورسکردنی باری سەرشانی مێرمندالآن بەئیش کردن)کە(١١، ٢٢)بەدەست هێناوە، ئەمەش مانای بونی جیاوازیە لەنێوان ڕەگەزی نێرو مێدا سەبارەت بەو هۆکارە، خشتەی ژمارە (٦)ئەوە نیشاندەدات.

بەخشتەی ژمارە (٦)

ئامانجی دووەم وەرخستنی دەستەواژەکان و ریزبەندیان بۆ زانینی جیاوازی هۆکارەکان بەپێی گۆڕاوی رەگەز

| ژ | ریزبەندی لەفۆرمدا | دەستەواژەکان | ت محسوبە | ت نظرية | مستوى الدلالة | د.الحرية |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢٣ | فۆرس کردنی باری سەرشانی میرمندال بەبێش کردن | ٢٢.١١ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٢ | ٢٠ | تێنەگەیشتن لەمیرمندال و قوناغەکانی ژیانی | ٦٨.٩ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٣ | ١٦ | سەرکەوتو نەبوە لەقوتابخانەدا | ٨١.٨ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٤ | ١٣ | بەهۆی ناتەواوی ژیریەوە | ٠٩.٦ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٥ | ٢ | بەهۆی توندوتیژی خێزانەوە | ٨٩.٥ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٦ | ١٩ | بونی ئاژاوە لەناو خێزاندا | ١٩.٥ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٧ | ١٧ | توشی بەربەرەکانی دەرونی بووە | ٩٩.٤ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٨ | ١٠ | خۆی لەئیشکردن دزیوەتەوە | ٣٠.٤ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٩ | ١٤ | بەهۆی جیاوازی چینایەتیەوە | ٠١.٤ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٠ | ٥ | هیچ گرفتێکی نیە | ٩٣.٣ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١١ | ٢٢ | خۆی لەقوتابخانە دزیوەتەوە | ٠٩.٣ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٢ | ١٨ | فەرامۆش کراوە لەلایەن خێزانەوە | ٩٥.٢ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٣ | ٢٤ | بەهۆی هەلوەشانەوەی خێزانەوە | ١٣.٢ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٤ | ٨ | دەستی پیسە (فێری دزی بووە) | ٠٧.٢ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٥ | ٧ | بونی هاورێی خراپ | ٠٣.٢ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٦ | ٩ | داوای شتی کردوە و بۆی جێبەجێ نەکراوە | ٨٨.١ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٧ | ٢٥ | نەبونی شارەزایی دایک لەپەروەردەکردنی دروستی منداڵ | ٦٩.١ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٨ | ٢٦ | جیاوازی کراوە لەگەڵ ئەندامەکانی تری خێزانەکەی | ١٣.١ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ١٩ | ١٥ | بڵاوبونەوەی خراپی لەناو کۆمەڵدا | ٧٥.٠ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٢٠ | ٢١ | تێرنەکردنی حەزو ئارەزووەکان میرمنداڵ | ٥٤.٠ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٢١ | ٣ | هەژاری وکەم دەرامەتی | ٥٢.٠ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٢٢ | ١٢ | عینادە وبەقسەی کەس ناکات | ٢٧.٠ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٢٣ | ٤ | ترسان لەسزای ئەو هەڵەی کەکردویەتی | ٢٤.٠ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٢٤ | ٦ | نەبونی سەرپەرشتی لەناو خێزاندا | ٠٩.٠ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٢٥ | ١ | هەست دەکەین نەمانی باوک ودایک هۆکارێک بێت | ٠٣.٠ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |
| ٢٦ | ١١ | باری بوری دراوەتی | ٠٢.٠ | ٩٩.٥ | ٠٥.٠ | ٢ |

بۆجێبەجێکردنی ئامانجی سێهەم (ئایا جیاوازی هەیە لەنێوان شوێنی نیشتەجێ بونی مێرمندالآن دا دەربارەی هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرمندالآن لەخێزانەوە بۆسەرجادە)، بەهەمان شێوە وەکو ئامانجی دووەم توێژەر دووجای کای(مربع کای) بەکارهێنا کەتایبەتە بەدەرخستنی جیاوازیەکان بەئاستی نیشاندانی(مستوی الدلالة)(٠.٠٥) وژمارەی سەربەستی (٢)، بەم پیە لەئەنجامەکەدا دەرکەوت کەدەستەواژەی(٤) (ترسان لەسزای ئەو هەڵەیکەکردویەتی) کەنمرەی(٢٤، ٤٤)بەدەستهێنا، کەبونی جیاوازی لەنێوان شار لەگەڵ( شارۆچکە، کۆمەڵگا، لادێ)پیشان دەدات وواتە جیاوازی هەیە لەنێوان هەردوو گۆڕاوەکەداو دەربارەی ئەو هۆکارە وەك لەخشتەی ژمارە(٧) نیشاندراوە.

**نەخشەی ژمارە ( ٧ )**

**ئامانجی سێهەم و ڕیزبەندی دەستەواژەکان بۆ زانینی جیاوازی هۆکارەکان بە پێی شوێنی نیشتەجێبوونیان**

| ژ | لەهۆزمەندا ی ڕیزبەندی | دەستەواژەکان | ک۲ محسوبە | ک۲ جدولیە | دلالە مستوى | د.الحریە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | .٤ | ترسان لەسزای ئەو هەڵەیەی کە کردوویەتی. | ٤٤ .٢٤ | ٩٩ .٥ | .٠٥ | ٢ |
| ٢ | .١ | هەستی دەکەیت ئەمانی (باوك و | ٢٩ .١٠ | ٩٩ .٥ | .٠٥ | ٢ |
| ٣ | ١٨ | دایك)هۆکارێك بێت. فەراموش کراوە لەلایەن | ٢٢ .٨ | ٩٩ .٥ | .٠٥ | ٢ |
| ٤ | ٢٤ | خێزانەوە. | ٤٦ .٥ | ٩٩ .٥ | .٠٥ | ٢ |
| ٥ | ٢٠ | بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزانەوە. | ٥٣ .٣ | ٩٩ .٥ | .٠٥ | ٢ |
| ٦ | .٥ | تێنگە یشتن لەمێرد مندالآن و قۆناغەکانی | ٧١ .٢ | ٩٩ .٥ | .٠٥ | ٢ |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٧ | ١٣ | ژیانی. | ٦٧،٢ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٨ | ٦. | هیچ گرفتێکی نیە. | ٢٢،٢ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٩ | ١٥ | بەهۆی ناتەواوی ژیرییەوە. | ١٦،٢ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ١٠ | ١٧ | نەبوونی سەرپەرشتی لەناو خێزاندا. | ٢،٠٨ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ١١ | ١٩ | بڵاو بوونەوەی خراپی لەناو کۆمەڵدا. | ٨٧،١ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ١٢ | ١٠ | تووشی بەربەرەکانی دەروونی بووە. | ٧٩،١ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ١٣ | ٢. | بوونی ئاژاوە لەناو خێزاندا. | ٢٨،١ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ١٤ | ٧. | خۆی لەنیشکردن دزیوەتەوە. | ١،٠٥ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ١٥ | ٣. | بەهۆی توندو تیژی خێزانەوە. | ٠،٨٧ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ١٦ | ٢٥ | بوونی هاورێی خراپ. | ٠،٧١ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| | | هەژاری و کەم دەرامەتی. | | | | |
| ١٧ | ٨. | نەبوونی شارەزایی دایك لەپەروەردەی | ٠،٦٢ | ٩٩،٥ ٠،٠٥ ٠،٠٥ | | ٢ |
| ١٨ | ٢٢ | دروستی مێرد منداڵ. | ٠،٤٢ | ٩٩،٥ | | ٢ |
| ١٩ | ١٤ | | ٠،٣٨ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٢٠ | ٢٢ | دەستی پیسە (فێری دزی بووە). | ٠،٢١٤ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٢١ | ٢١ | خۆی لەقوتابخانە دزیوەتەوە. | ٠،٣١ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٢٢ | ٩. | بەهۆی جیاوازی چینایەتییەوە. | ٠،١٦ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٢٣ | ١٦ | قورس کردنی باری سەرشانی مێرد منداڵان | ٠،١١ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٢٤ | ٢٦ | بەنیشکردن. تێرنەکردنی حەزو ئارەزووەکانی | ٠،١٠ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٢٥ | ١٢ | مێرد منداڵان. | ٠،٠٧ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |
| ٢٦ | ١١ | داوای شتی کردووە بۆی جێ بەجێ نەکراوە. | ٠،٠٣ | ٩٩،٥ | ٠،٠٥ | ٢ |

سەرکەوتوو نەبووە لەقوتابخانەدا .

جیاوازی کراوە لەگەڵ ئەندامەکانی تری

خێزانەکەی. عینادی بەقسەی کەس ناکات.

نازی زۆری دراوەتێ.

## ب- شیکردنەوەو تاوتوێ کردنی ئەنجامەکان:-

لـــــــەم بەشـەدا هەوڵـدەدەین ئـەو ئەنجامـەی کەلەتوێژینەوەکـەدا دەستمان کەوتوە، بەپێ ی ئامانجی توێژینەوەکەو بەشێوەیەکی زانستی شی بکەینەوە.

ســەبارەت بـەئامانجی یەکـەم.(هۆکارەکـانی ڕاکردنــی مێرمنــداڵان لەخێزانــەوە بــۆ ســەرجادە بۆهەردووڕەگــەز) ســەبارەت بــەم ئامانجــە هەوڵدەدەین کەگرنگترین ئەو هۆکارانەی بەپێ ی توێژینەوەکە دەرکەوتووە، شی بکەینەوە.بەڕەچاوکردنی پلەی بەراوردیان وئەو نمرەی کەبەدەستیان هێناوە،

هاوکێشەی فیشەر بـەکارهێنرا بـۆ دەرهێنـانی ئەنجامـەکانی ئامانجیەکـەم، دەکـــەوت کـــە دەســـتەواژەی(٢١)(تێرنـــەکردنی حـــەزوئارەزووەکانی مێرمنـداڵان)پلەیەکـەمی بەدەسـتهێنا بـەنمرەی(١، ٤٧) لـەم ئەنجامەشـەوە دەتـوانین بڵـێین کـەزۆرترین ئـەو هۆکارانــەی کەدەبنــە هــۆی ڕاکردنــی مێرمنـــــــداڵان لـــــــەخێزان.لەئـــــــەنجامی تێرنـــــــەکردنی حەزوئاردزوکانیانەوەیە.چونکە لەو قۆناغەی منداڵیدا زۆر پێویستە گرنگی بەحـەزوئارەزوویان بـدرێت، کەپێویسـتە بـۆ بنیاتنـانی کەسـێتی وگەشـەی گەشـەی کۆمەڵایـەتی وجەسـتەی وژیـری، خۆنەگـەرخێزان نـەیتوانی ئـەو پێداویسـیانە فەراهـەم بکـات، ئـەوا مێـرد منـداڵ هەوڵـدەدات بەڕێگـەی تـرلـەدەرەوەی چوارچێوەی جێـزان دەسـتەبەریان بکـات وئەمـەش لەگـەڵ بۆچـونی زۆریـك لـەزانایانی کۆمەڵایـەتی ودەروونناسـیەك دەگرێتـەوەو

بەتایبــەتی ئەوبۆچـونانەی کەتایبەتــە بەپێداویســتیەکانی تــاك، چـونکە تێرنــەکردنی حــەزوئارەزوەکانی مێرمنــدالّ بــەدابینکردنی پێداویستیەکان، حاڵەتێکی نائارامی وناجێگیری لای مێرمندالّ دروست دەکات وپاڵنەرەکانیش بــۆ تێرکردنــی ئەوحـــەزو ئارەزوانەچـــالاك دەبــن. هەرمەکــەی زانـــای دەروونناسی(ابراهام ماسلۆ) کەتایبەتە بەپێداویستیەکانی تاك، ڕاستی ئەمـە دەســەلێنیّ، چـونکە تێرکردنــی پێداویستیە ســەرەتاییەکان و تێرکردنــی حـــەزوئارەزوەکان لەبناغـــەی هەرەمەکەدایـــە دوابـــەدوای ئـــەم هۆکـــارە هۆکــاری(هەژاریوکــەم دەرامـــەتی)کەدەســـتەواژەی(٢)ە، پلــەی دووەمـــی وەرگرتووە بەنمرەی(١، ٤٤)، بەم مانایەهەژاری وکەم دەرامەتی خێزان ڕێگرە لەبەردەمــدابینکردنی پێداویســتیەکانی مێرمنــدالّ بەمــە ش مێرمنــدالّ بەبەراوردکردنی خۆی لەگەلّ مێرمندالّی تری هاوتەمەن وهاوڕێ ی هەست دەکات کەبیّ بەشە لەو شتانەی کەهاوڕێکانی هەیانە، لەگەلّ ئەوەشدا لەڕوی ژیریەوە ناتوانێت ئەو بیّبەش بونەوەك حاڵەتێکی ئاسایی وەربگرێت، بەڵکو هــەولّ دەدات بەهــەرجۆرێك بێــت ئــەو شــتانە دەســتەبەر بکــات یــاخود بەهەنــدێك هەڵســکەوت جێگــەی ئــەو پێداویســتیانە پڕبکاتــەوەو بــەلاّم ئەمانــەش لەگــەلّ بۆچــون و پابەندبونــەکانی خێزانەکــەی یــەدادەگونجیّ، بۆیەپەنا دەباتە بەر ڕاکردن، وەك(تەعویزێك) بۆ ئەوحالّەتە، هەڵبـەت ئـەم حالّەتە بــەزۆری تایبەتــە بەوخێزانــە هەژارانــەی کــە لەگــەلّ هــەژاری وکــەم دەرامەتیەکەشدا، نــاتوانن بەشــێوازێکی پــەروەردەیی گونجـاو مامەڵـە لەگـەلّ ئــەو حاڵەتــەدا بکــەن.هۆکــارێکی تـــر دەســـتەواژەی(٢٠)ە کـــەنمرەی(١، ٤٢)وەرگرتوە ئەویش تیّ نەگەیشتن لەمێرمندالّ وقۆناغەکانی ژیـانی)یـەتی،

بـۆ شـیکردنەوەی ئـەم هۆکـارەش دەتـوانین پشـت بـەتیۆرەکانی بـواری سـایکۆلۆژی گەشـەو سـایکۆلۆژی منـداڵ ببەستین، کەجـەخت دەکەنـە سـەر قۆناغەکانی منداڵ وکێشەو پێداویستیەکانی لێکدەدەنەوەئاماژەش، بەجۆری مامەڵەو پەروەردە بۆچۆنیەتی گەشەکردنی

هەڵچونیـو ژیری وکۆمەڵایەتی و جەسەدی دەکەن، لـەم بـارەوە قوتابخانـەی ڕەشـتی ئامـاژەی بەوەداوەکـە ئەگـەر نـەتوانرێت مامەڵـەی گونجـاو لەگـەڵ ڕەفتـارێکی ناکۆمەڵایـەتی یـان، نابـەجێ ی منداڵـدا بکرێـت ئـەوا خۆمـان بەرپرسـین لـەلادانی ئـەو منداڵـە، چـونکە زانـین وشـارەزایی لەقۆناغـەکانی گەشەی منداڵدا زانیاریمان لەسەر کێشەو گرفتەکانی مێرمنداڵ زیاد دەکات، لەوێشـەوە دەتـوانین بەشـێوازێکی گونجـاوو پـەروەردەیی مامەڵـە بکـەین و منداڵان و مێرمنداڵان لەمەترسی لادان دور بخەینەوە.هۆکارێکی کاریگـەری تـر کەپلـەی چـوارەمی بـەنمرەی(١، ٣٩) بـەپێی هاوکێشـەی فیشـەر بەدەستهێناوە، دەستەواژەی(١)ە(هەست دەکەین نەمانیدایك، باوك، هۆکارێك بێـت) ئـەم هۆکـارەش گرنگـی دایـك و بـاوك دەردەخـات لـەژیانی منـدال و مێرمنـدالان داچـونکە یەکـەمین ژینگـەو یەکـەمین قوتابخانـەی پـەروەردەییتاك ( بـاوك و دایـك) کەمنـداڵ لـەرێی لاسـایکردنەوەو دوبارەکردنـەوەوە فێـری زۆرهەڵسوکەوت و نهێنـی ژیـان دەبێـت، ئەوسـۆزو خۆشەویستیەی کە دایك و باوك دەیدەنـە منـداڵ، کاریگـەری دەرونـی خـۆی هەیەو زۆرجارمنـداڵ لەئاستی دایـك و بـاوك دا چاو لەزۆرسـزادان دەپۆشـێ کـەدایك یـا بـاوك پـێ ی هەسـتابێت. بەنـەمانی دایـك و بـاوك بۆشاییەکیدەرونی لایمنـداڵ دروسـت دەبێـت کـە هەنـدێجار توشـی لادانـی

کۆمەڵایەتی دەکات لەم بارەیەوە دکتۆرجۆن پولیە دەڵێ"بێ بەری بونی منداڵ لەسۆزی دایك یەکێکە لەهۆکارە سەرەکیەکانی شکست هێنانی منداڵ لەخوێندن وسەرهەڵدانی لادانی کۆمەڵایەتی"هەروەها جەخت دەکات لەسەر ئەوەی کە (بێبەری بون لەسۆزو خۆشەویستی و فاکتەری سەرەکی شکست هێنانە لەزۆربەی بوارەکانی ژیاندا، ئەمە بۆ بێ بەری بون لەباوکیش ڕاستە)(کەساس، ۲۰۰۰، لا۲٤۲).

هەروەها نەمانی دایك و باوك لەجیهانی منداڵ، کاردەکاتە سەر لایەنی دەرونی منداڵ و توشی گرفتی دەرونی ونەخۆشی دەرونی دەکات لەژیانی داهاتویدا، وەك نەخۆشی دڵە ڕاوکێ و(اظطرابات)و شڵەژان دەبێت.(سامیە حمام، ۱۹۸٥لا۸٥) .

(بونی هاوڕێ ی خراپ) کەدەستەواژەی (۷)ە بەهەمان شێوە پلەی چوارەمی بەدەست هێناوە بەنمرەی(۱، ۲۹) بەم پێیە مێرد منداڵ لەڕێ ی کاریگەری هاوڕێ ی خراپەوە، توشی ڕاکردن دەبێت، چونکە کاریگەری مێرد منداڵ لەسەر هاوتەمەنەکانی زیاترە لەگەورە، چ بەباش چبەخراپ)، هاوڕێی خراپ هەڵدەستێ بە(اغرائ)کردنی مێرمنداڵانی هاوڕێ ی بەشێوازی جیاجیا وەك(چون بۆ سینما کات بەسەربردن لەباخچەکان و سوڕانەوە بەشەقامەکاندا)کەئەمانەش کاریگەرییان دەبێت لەسەر ئاڵودەکردنی مێرمنداڵ بۆ ڕاکردن(أسعد، ۲۰۰۲لا۱۲۰).

بەلام دەبێت ئەوەش بزانین کەهاوڕێیەتی بنەمایەکی کاریگەرە بۆ گەشەی منداڵ لەبواری دەروونیدا.ئەم بۆچونەش دکتۆر(ویلاردهارتۆپ)مامۆستای دەرونزانی منداڵ لەزانکۆی( میتسووتا)

لەسەر ئەوە دڵنیایی دەکاتەوە، کە(هاوڕێیەتی لەلای منداڵ شتێکی سادەو ساکارنیە، بەڵکو یەکێکە لەپێداویستیەکانی ژیان، وەك خواردن و نوستن و هەواو ئاو)کەساس، ٢٠٠٠، لا٦٢) .

(بڵاوبونەوەی خراپی لەناوکۆمەڵ دا) کەدەستەواژەی (١٥) پلەی پێنجەمی بەدەست هێنا وەبەنمرەی(١، ٣٨)، هۆکارێکی تری ڕاکردنی مێرمنداڵەو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەولادانە کۆمەلأیەتیەی کەکۆمەڵ توشی بووە، بەتایبەتی دایك و باوکی مێرمنداڵ، وەك( ئالۆدەبونی دایك یان باوك لەسەر خواردنەوە ولادانیان لەڕەوشتە کۆمەلأیەتیە پەسەندکراوەکان، چونکە لەم حاڵەتەدا منداڵ بەراوردی(دایك یان باوك)ی‌دەکات لەگەڵ(باوك ودایکی) هاوڕێو هاوتەمەنەکانیدا، دواتر بۆدەربازبوون لەوحاڵەتە پەنا دەباتە بەر ڕاکردن وڕۆیشتن لەخێزان. هۆکارێکی تر بۆ ڕاکردنی مێرمنداڵ) لەخێزاندا، نەبونی شارەزایی دایك لە پەروەردەی دروستی مێرمندالأندا)، کەدەستەواژەی(٢٥) بەنمرەی(١، ٣٦) وەرگرتووە بەپلەی شەشەم و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەهەندێك خێزان شێوازێکی گونجاویان نیە بۆ پەروەردەکردنی مێرمنداڵ وبەڵکو هەرجارەی جۆرێك شێواز بەکاردەهێنێت وئەمەش لەئەنجامی نەشارەزایی خێزانەوەیە، چونکە نەشارەزایی لەشێوازەکانی پەروەردەونەزانین لەچۆنیەتی هەڵبژاردنی شێوازێکی گونجاوی پەروەردەیی ناهاوسەنگیەك و سەرلێ شێوان لای مێرمنداڵ دروست دەکات.

بۆجێبەجێکردنی ئامانجی دووەم، (ئایا جیاوازی هەیە سەبارەت بەهۆکارەکانی ڕاکردنی مێر منداڵان لەخێزانەوەبۆسەرجادە بەپێ ی

ڕگەز)لەئەنجامەکەدا دەکەوت کەدەستەواژەی (٢٣) (قورس کردنی باری سەرشانی مێرمندالآن بەئیشکردن)نمرەی (١١،٢٢) بەدەست هێناوە ئەم ئەنجامەش بونی جیاواز دەردەخات لەنێوان هەردوو ڕەگەزدا واتە جیاوازی هەیە لەنێوان هەردوو ڕەگەزدا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەئیشکردن لای هەردووڕەگەز جیاوازە، یاخود لەش و لاری کوڕان جیاوازە لەگەڵ لەش ولاری کچاندا، هەروەها لەکۆمەڵگەی کوردیدا ئیش زیاتر بەڕەگەزی نێردەکرێت، وەدەستەواژەی(٢٠)(تێنەگەیشتن لەمنداڵ وقۆناغەکانی ژیانی) (٩، ٦٨) بەدەست هێناوە، بونی جیاوازی

نیشاندەدات، چونکە تێگەیشتن لە مێرمنداڵ و قۆناغەکانی بەشێوەیەکی گشتی کارێکی ئاسان نیەو تێگەیشتنی بەخێوکەر بۆ مێرمنداڵەکەیْ لەکوڕە وە بۆکچ دەگۆڕێت و ئەمەش بەهۆیئەو گۆڕنکاریی یەجیاوازییە فسیۆلۆژیو جەستەیی و دەرونیانەوە کەڕودەدات لەلای هەردووڕەگەزو نەزانینی ئەم گۆڕانکارییانە لای بەخێوکەرکە لەمێرمنداڵەکەدا ڕودەدات، دەبێتە هۆی دروست بونی گرفت لە خودی مێرمنداڵەکەداو بەوەی ناتوانێت بەرەنگاری ئەو گۆڕانکارییانە ببێتەوە، سەبارەت بەدەستەواژەی (١٦)(سەرکەوتوو نەبوو لەقوتابخانەدا)کەنمرەی(٨، ٨١)بەدەستهێناوە، بوونی جیاوازی دەردەخات لەنێوان هەردووڕەگەزدا، ئەمەش هەروەکو دەزانین کە کەسەرنەکەوتنی مێرمندالآنی کوڕ جیاوازە لەگەڵ مێرد منداڵانی کچدا، وەدەستەواژەی (١٣) ( بەهۆی ناتەواوی ژیرییەوە ) کە(٦، ٥٩) بەدەست هێناوە، کەبونی جیاوازی دەردەخات لەنێوان هەردوو ڕەگەزدا ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هۆکاری ژیری بۆ ڕاکردنی مێرمندالآن جیاوازە

لای بـەخێو کـەرەکانیان، چـونکە داب و نەریتـە کۆمەڵایەتیـەکان ڕەگـەزی مێینـە ئەگـەر لـەڕووی ژیریشـەوە ناتـەواوبن بچنـە، سـەرجادەکان، بەوپیـە بەهای کۆمەڵایەتی و ئاکاری ئەو خێزانە نامێنێ بەڵام ئەمە بۆ ڕەگەزی نێر وانیـە بـەڵام دەسـتەواژەی(۲)(بـەهۆی توندوتیـژی خێزانـەوە)کـەنمرەی(۵، ۸۹)بەدەست هێناوە بونی جیاوازی دەرناخات لای هەردووڕگـەز، واتـە توندو تیژی خێزان بەرامبەر منداڵەکانیان وەکو یـەك وان وچونکە توندو تیـژی بـەردەوام وا لـە مێرمنـداڵ دەکات لـەو ئـازارو بـێ ئارامیـە ڕزگاریـان بێـت. یگهورن دەڵێ"پێویستە ئەو ئازو ئەرمیـەو وئـەو سزایەی بەمنداڵەکانمان دەدەین، هاوسەنگیەکی تیادابێت"(شکور، ۱۹۹۹، ل۲۱) .

دەسـتەواژەی (۱۹) (بـونی ئـازارە لـەناو خێزانـدا) نمـرەی (۵، ۱۹) بەدەستهێناوە، ئەمەش بونی جیاوازی دەرناخات، واتە جیاوازی نیە لەنێوان هـەردوو ڕەگـەزدا چـونکە بـونی ئاژاوە لـەناو خێزانـدا هاوشێوەیە لـەنێوان هەردوو ڕەگەزدا، ئەویش بەهۆی ڕێك نەکەوتنی ژن و مێرد ویان خیانەتی هاوسـەرێتی، یـان هاوسـەرێتی سـەرنەکەوتوو، یـان نـەگونجانیان لـەڕووی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریەو ئابوریەوەویان بـەهۆی جیابونـەوەیان لەیـەکتری، یـاخود دورکەوتنـەوەی بـاوك لەماڵـەوە بـەهۆی ئیشکردنەوو(شـکور، ۱۹۹۹، لا۲۰). کەئەمانە دەبێتە هۆی ڕاکردنی مێرمنداڵان لەماڵەوە بۆ سـەرجادە، سەبارەت بەدەستەواژەی(۱۷)، (توشی بەربەرەکانی دەرونی بووە) کەنمرەی(٤، ۹۹) بەدەستهێناوە، جیاوازی دەرناخات لـەنێوان ڕەگـەزی نێـرو مـێدا و واتـە هۆکاری بەربەرەکانی دەرونـی لای هـەردوو ڕەگـەز هەیـەو کەبـەهۆی بـونی

ئاژاوه بەردەوام لەناو خێزانـدا و هەست کـردن بەبەربەست و شەرکردن و هەروەها لەهەست کردن بەتەنهاییەوە ڕوودەدات(ئەسعەد، ٢٠٠٢، لا٢٢) .

سـەبارەت بـەئامانجی سـێهەم، (ئایـا جیـاوازی هەیـە سـەبارەت بـەهۆکارەکانی ڕاکردنـی مێرمنـدالآن لەخێزانـەوە بۆسـەر جـادە، بـەپێ ی شـوێنی نیشـتەجێبونیان(شـار، شارۆچـکە، کۆمـەلگا، لادێ)، لەئەنجامـدا دەرکـەوت کەدەسـتەواژەی (٤) ( ترسـان لەسـزای ئـەو هەلـەی کەکردویـەتی)نمـرەی (٢٤، ٤٤) بەدەستهێناوە کـەبونی جیـاوازی ئـەو هۆکـارە پیشـاندەدات لـەنێوان (شـار) لەگـەلْ(شارۆچـکە، لادێ. کۆمـەلگا)، ئەمـەش دەگەڕێتەو بۆئەوەی کە ئـەو سـزایەی کەلەشـاردا ئـەنجاد دەدرێـت بەرامبـەر بەمێرمندالآن، جیاوازە لەگەلْ ئەو سزایەی کەلەشارۆچکەو لادێ و کۆمـەلگا بەرامبـەر مێرمنداڵـەکانیان دەکرێـت، هـەروەها پەیونـدی هەیـە بەئاسـتی ڕۆشنبیری شوێنی نیشتەجێ بوونیانەو.

وەتوندوتیـژی ئـەو سـزایەو ترسـان لـەوەی کەهەلەیـەکی کـردووو چاوەڕێی سزا دەکات، دەبێتە هۆکارێکی گرنگ بۆ دەرباز بوونی مێرمندالآن لەو سزا یەو چونکە هەتا سزادانی مێرمنـدالآن تونـدبێت، ئەواهەولْدان بـۆ ڕاکردنی مێرمنـدالآن زیاتر دەبێت (ئەسعەد، ٢٠٠٢، لا١٢٢).

دەستەواژەی (١) ( هەست دەکەین نەمانی (دایك وباوك)هۆکارێك بێت، کەنمرەی (١٠، ٢٩) بەدەست هێناوەو کـەبونی جیـاوازی پیشـاندەدات لـەنێوان شوێن نیشتە جێبووندا، چونکە نەمانی دایك و باوك لەناو شاردا کاریگەری تایبـەتیخۆی هەیەلەگـەلْ نـەمان دایکـو بـاوك دەرەوەی شـاریان بلـێین نیمچـەجیاوازیەك هەیـە، ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو پەیوەندیـە

کۆمەڵایەتیە پتەوەی کەلەدەرەوەی شاردا یاخود( لەشارۆچکەو کۆمەلگاو لادێ) بەدی دەکرێت، جیاوازە لەگەڵ ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیانە کەلەناو شاردا هەیە، دەستەواژەی هەژدە(١٨) (فەرامۆشکراوە لەلایەن خێزانەو) کە(٨، ٢٢) بەدەستهێنا، کەبونی جیاوازپیشاندەدات لەنێوان ئەو مێرمندالانە کەلەناو شاردا دەژین ولەگەڵ ئەو مێرمندالانەی کەلەشارۆچکەو کۆمەلگاو لادێ دەژین، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەمێرمندالان لەناوچەکان دەرەوە شاردا کەناوچەیەکی بەرفراوانە زیاتر لەماڵەوەنین، یاخود دەچنەدەرەوەوبەلام لەناو شاردا بەهۆی تەسکی شار و دیاریکردنی شوێنەکانی مێرمندالان کەبۆی دەچن جیاوازە، هەروەها دەستەواژەی (٢٤)( بەهۆی هەلوەشانەوەی خێزانەوە )کەنمرەی (٥، ٤٦) بەدەست هێناو بونی جیاوازی دەرناخات، لەنێوان شوێنی نیشتەجێ بونی مێرمندالان وچونکە هەلوەشانەوەی خێزان هەمان کاریگەری نێگەتفانەی هەیە لای مێرمندالان، جا لەشاربێت، یا لەلادێ، کۆمەلگا، شارۆچکە)، هەلوەشانەوەی خێزانیش یان بەهۆی جیابونەوە دایک و باوک یان مردنی دایک و باوک، یاخود یەکێکیان کەنەمانی بەخێوکەر، دەبێتەهۆی سەرگەردانی وسەرلێشێواوی مێرمندالڵ و پەرتەوازەبونی، چونکە ئەگەر مێرمندالڵ شوێنێک جێگیر نەبێت تیا بمێنێتەو، ئەوا توشی گرفت دەبێت، دەستەواژەی (٢٠) (تێنەگەیشتن لەمێرمندالڵ و قۆناغەکانی ژیانی) نمرەی (٣، ٥٢) بەدەستهێنابونی جیاوازی دەرناخات لەنێوان شوێنی نیشتەجێ بونی مێرمندالان لەناو شارو دەرەوەی شاردا.هەروەک لەئەنجامەکەدا دەرکەوتووە(بەتاڵ) کەتێنەگەیشتن لەمێرمندالڵ و قۆناغەکانی ژیانی هەردووگۆڕراوەکە لەناو شارو دەرەوەی

شاردا نەگەیشتونەتە ئەو ئاستەی کەلەژیان وقۆناغەکانی مێرمنداڵەکانیان بگەن، وەدەستەواژەی(٥) (هیچ گرفتێکی نیە) کەنمرەی(٢، ٧١) بەدەستهێناوە، ئەووەمان نیشاندەدات کەجیاوازی نیە لەنێوان مێرمندالآنی شارو مێرمندالآنی دەرەوەی شارداوهەروەها سەبارەت بەدەستەواژەی(١٢) (بەهۆی ئاتەواوی ژیریەوە) کەنمرەی(٢، ٦٧) بەدەست هێناوە کەبونی جیاوازی دەرناخات لەنێوان شوێنی نیشتەجێبونی مێرمندالآندا، واتە هەمان هۆکارە لەلای بەخێوکەری مێرمندالآنی ناوشارو دەرەوەی شار، کەوایان لێ دەکات رابکەن لەناو خێزاندا.

## پێشنیاز(المقترحات)

١ گرنگـی دان بـەڕۆڵی ڕاگەیانـدن، سـەبارەت بەهۆشـیاری کۆمەلآیـەتی وپەروەردەیی منداڵان لەگەڵ، گرنگی دان بەقۆناغـەکانی ژیـانی منـداڵان ونەو گۆڕانکارییانەی کەدێتە ڕێگایان.

٢ ئامادەکردنی بەرنامەیەکی تایبەت لەمیدیاکاندا، بۆ ووشیاری خێـزان و ئەوانەی منداڵ پەرومردە دەکەن، بۆ ئـەوەی لەسـەر ڕێگایـەکی زانستیانە منداڵەکانیان پەروەردە بکەن.

٣ ووشیاری دایکان و وباوکان(بەخێوکەران) بـۆ ڕووبەڕووبونـەوەی گرفتـەکانو چارەسەری گونجاو بۆیان، بۆ ئەوەی لەداهاتو دا کاریگـەری نێگەتیڤانـەی لەسەریان نەبێت.

٤ ڕۆشنبیری کردنی دایکان و باوکان(بەخێوکەران)بەوەی لەکاتی لەدەستدان یـەکێك لەئەنـدامانی خێـزان، یـان هـەر ڕوداوێکـی ترسـناك، کـارێکی وانەکەن کاردانەوەی خراپی بەسەر منداڵەکانیانەوە هەبێت.

٥ هۆشـیاری خێـزان بـەوەی کەلەلێـدانی جەسـتەیی منداڵـەکانیان دوورکەونەوە.

٦ پێویستە لەسەر دایکان و باوکان (بەخێوکەران)، بەدوای هۆکاری ڕاکردنی منداڵەکانیان دابگەڕێن، بۆئەوەی دووبارە نەبێتەوە.

٧ هاوکـاری کردنـی ئەوخێزانـە هەژارانـەی کەمنـداڵکانیان ڕادەکەنـە سـەر جادە.

## ڕاسپاردە (التوصيات)

١ ئەنجامدانی توێژینەوەیەك لەسەر چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ مێرمندالآنی سەرجادەدا.

٢- ئەنجامدانی توێژینەوەیەك لەسەر چۆنیەتی پەروەردەکردنی سەرەتایی(بنچینەیی) بۆ مێرمندالآنی سەرجادە.

٣ ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی مەیدانی وتیۆری، لەسەر ئەو کاریگەرە دەرونیانەی، کەتوشی خێزانی ئەومێرمندالآنە دەبێت کەڕایان کردۆتە سەرجادە.

٤- ئەنجامدانی توێژینەوەیەك بۆ زانینی باش بونی هەڵسوکەوتی مێرمندالّ.پاش گەڕانەوەی بۆناوخێزان.

٥ ئەنجامدانی توێژینەوەیەك لەسەر هۆکاری دووبارە ڕاکردنەوەی مێرمندالّ لەناو خێزانەوە بۆ سەرجادە.

٦-ئەنجامدانی توێژینەوەیەك لەسەرمانەوەی زۆریمێرمندالآن لەسەر جادەو کاریگەرە زۆرخراپەکانی داهاتووی.

٨ ئەنجامدانی توێژینەوەیەك لەسەر(باش وخراپ) مانەوەی زۆری مێرمندالآنی سەرجادە لەخانەکاندا.

# سەرچاوەکان

کوردی:


١-قەرەچەتانی، کەریم شەریف ١٩٩٧-سایکۆلۆژیای منداڵ چاپخانەی زانکۆ-هەولێر چاپی یەکەم.

٢-کەساس، محمد-٢٠٠٠- سایکۆلۆژیەتی پەروەردەکردن-چاپخانەی دەزگای سەردەم-سلێمانی چاپی یەکەم.


عەرەبی:


٣-البياتي، عبدا الجبار وذكريا ذكى أثناسيوس-١٩٩٧-الإحصاء الوصفي والاستدلالي في التربية وعلم النفس مؤسسة الثقافة العالمية بغداد.

٤ البياتي، محمد سليمان إبراهيم ١٩٨٥ بعض جوانب شخصية الحدث فاقد الوالدين(دراسة مقارنة)

جامعة بغداد-رسالة ماجستير غير منشورة.

٥-أبو خالد، فوزية عبدالله٢٠٠٢ أطفال الشوارع الوطن و الأمير طلال مأخوذة من الانترنيت.

٦-أبو خوار، حسن-١٩٩٧ قانون أحداث الجانحين مطبعة جامعة دمشق-مطبعة سادسة.

٧ أسعد، يونس ميخائيل ١٩٩٨ مشكلات سلوكية للأطفال مدينة نصر.

٨ العاني، شاكر محمد ١٩٤٩ أسباب التشرد وتأريخه في الشرق العدد(١٠) السنة الثالثة.

٩ العظماوى، إبراهيم كاظم معالم سيكولوجية الطفولة الفتوة والشباب دار الشؤون الثقافة العامة بغداد طبعة الأولى.

١٠ الهاشمي، عبد الحميد محمد، ١٩٨٩ المرشد في علم النفس الاجتماعي دار الشروق جدة الطبعة الثانية

١١ حسن، إحسان محمد و عبد المنعم الحسنى ١٩٨٢ طرق البحث الاجتماعي مطبعة مديرية الطباعة والنشر جامعة الموصل طبعة الأولى.

١٢ حمام، سامية ١٩٨٥ أثر غياب الأب عن عالم الطفل مجلة التربية عدد(٦٤)

١٣ زهران، حامد عبد السلام ١٩٨٤ علم النفس الاجتماعي عالم الكتب الناشر القاهرة – طبعة١٥.

١٤ شكور، جليل وديع ١٩٩٨ أمراض المجتمع الأسباب الأصناف الوقاية والعلاج مطبعة الدار العربية للعلوم طبعة الأولى.

١٥ عبد الرحيم وتةلعةت حسين ١٩٧٨ حرمان التلميذ من الام وعلاقته ببعض نواحي تكيفه الشخص والاجتماعي في مرحلة الابتدائية جامعة المنصورة مصر رسالة الماجستير غير منشورة.

١٦ عبد المعصود، محمد ٢٠٠٢ أطفال الشوارع قنبلة موقوتة تهدد دول الشرق الأوسط مأخوذة من الانترنيت.

١٧ على، حميد ٢٠٠٢ عمالة الأطفال انتهاك لطفولتهم مأخوذة من الانترنيت.

١٨ عمـارة، الـزين العبـاس - ١٩٨٦ مـدخل الطـب النفسـي - دار الثقافـة - بيروت - الطبعة الأولى.

١٩ غيشـورو، ق، ك ١٩٨٧ تـربيـة أساسـية للأطفـال الشـوارع في نيروبـي مجلـة المستقبليات العدد٦ المجلد١٧

٢٠ قطـامي، نايفـة ومحمـد برهـوم ١٩٩٧ طـرق دراسـة الطفـل- دار الشـروق و الطبعة الثانية،

٢١ كمـال.علـى ١٩٨٣ الـنفس أمراضـها وانفعالاتهـا وعلاجهـا- دار الواسـط للدراسات والنشر والتوزيع-طبعة ثانية -بغداد.

٢٢ مصطفى.يوسف حمه صالح ١٩٩٠ معاملة الوالدين وعلاقتهما بتقدير الذات لـدى المـراهقين مـن أبنـاء الشـهداء وأقـرانهم الأخـرين جامعـة بغـداد -رسـالة ماجستير غير منشورة.

٢٣ ولكاسـت، تومـاس فينـزور ٢٠٠١ كارثـة بأسـم أطفـال الشـوارع-مـأخوذة مـن الانـترنيت.

٢٤ قانون العقوبات العراقي رقم ١١ لسنة ١٩٦٩ز

٢٥ ظاهرة أطفال الشوارع في الأردن ٢٠٠٢ مأخوذة من الانترنيت

٢٦ بحث عمالة أطفال في الأردن(دراسة مقارنة) ٢٠٠٢ مأخوذة من الانترنيت.

٢٧ الوطن العربي ٢٠٠١ ٥.١ مليون طفل يهيمون في شوارع مصر مـأخوذة مـن الانـترنيت.

٢٨ إسلام اون لاين ٢٠٠٢ غانا مواجهة أطفال الشـوارع بمعاقبـة آبـائهم مـأخوذة من الانـترنيت.

٢٩ رويترز ٢٠٠٢ مخرج مكسيكي يخوض أولى تجاربه مع أطفال الشوارع مأخوذة من الانترنيت.

ئينگليزی:

30 sharafaddin khan-a street children researcher—research (scf) uk-1997

## پاشکۆی ژماره(١)

منداڵپارێزی کوردستان

خانەی منداڵانی سەرجادە/ کوڕان

(أستبيان استطلاعی)

(باوکی، دایکی) بەڕێز ئەم کاتەت باش

توێژەر هەڵدەستێ بەئەنجامدانی توێژینەوەیەك لەسەر (هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرمنداڵان(نێر، مێ)لەخێزانەوە بۆ

سەرجادە لەدیدی بەخێوکەرەکانیانەوە) جا داوا لە بەڕێزتان دەکەین هاوکاریمان بکەن لەم بوارەداو ئەویش بەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی لای خوارەوە:

(ئەو هۆکارانە چین بەبڕوای تۆ کەوا لە(کوڕەکەت، کچەکەت) دەکات بێتە سەرجادە یان ماڵەوە بەجێ بهێڵێ)

## پاشکۆی ژماره(٢)

١) بەهۆی نەمانی(دایکی- باوکی)یەوە.
٢) بەهۆی توندووتیژی (باوکی- براکەی) ماڵەوە
٣) هەژاری وکەم دەرامەتی.
٤) هیـچ گرفتێکی نیە.
٥) ترساوە لەو غەڵەتەی کەکردویەتی.
٦) توندوتیژی باوەژنەکەی.
٧) بونی هاوڕێی خراپ.
٨) دەستی پیسە(فێری دزی بووە).
٩) نەبونی سەرپەرشتی لەناو خێزاندا.
١٠) هەڕەشەی کوشتنی لێکراوە.
١١) داوای شتی کردووە بۆی جێبەجێ نەکراوە.
١٢) خۆی لەنێش دزیوەتەوە.
١٣) بۆلای کەسو کاری ڕۆیشتووە.
١٤) نازی زۆری دراوەتێ.
١٥) غەڵەتی کردووە بۆیە ڕادەکات.
١٦) عینادە بەقسەمان ناکات.
١٧) بەهۆی ناتەواوی ژێرییەوە.
١٨) نەبونی هاوسەنگی لەنێوان چینەکانی کۆمەڵدا.
١٩) بڵاوبونەوەی فەسادیوخراپی ودرۆو غەش.
٢٠) لەقوتابخانە دەرنەچووە.
٢١) اهمالی دایکی وباوکی.
٢٢) نەبونی هیچ شێوە نازێك گرنگی پێنەدراوە.
٢٣) تووشی بەر بەرەکانی دەرونی توند بووە.
٢٤) ڕێك نەکەوتنی دایك وباوکی لەماڵەوە(نەگونجانیان بەیەکەوە).
٢٥) تێنەگەیشتن لەمێرمندالّ.
٢٦) تێرنەبونی پێداویستیەکانی مێرمندالّ.
٢٧) بەرگە نەگرتنی ئەو بەرپرسیارێتیەی کەلەخێزاندا هاتۆتە ڕێی

## پاشکۆی ژمارە(٣)

شارەزایان وپسپۆڕان:

١- د. فازل - مامۆستای کۆلیژی زمان- بەشی کوردی –زانکۆیسلێمانی

٢- م. ئاسۆ- مامۆستای کۆلیژی زانستە مرۆ ڤایەتیەکان بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سلێملنی

٣- م.واحد. مامۆستای کۆلیژی یاسا زانکۆی سلێمانی

٤- م.صابر مامۆستای کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتیەکان بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سلێمانی

٥- ێنسە نجاە- خوێندکاری خوێندنی باڵا لەکۆلیژی زانستە مرۆڤایەتیەکان بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سلێمانی

٦- ئەنوەر-توێژەری دەروونی لەمنداڵپارێزی کوردستان

٧- خۆشی لەتیف - توێژەری دەروونی لەرێکخراوی ئاسوودە

٨- علی ابراهیم- لێپرسراوی سێکتەری پاراستنی منداڵان لەمنداڵپارێزی کوردستان.

# پاشکۆی ژمارە (٤)

بەڕێز.................................ئەم کاتەت باش:

( هۆکارەکانی ڕاکردنی مێر منداڵان لەخێزانەوە بۆ سەر جادە لەدیدی بەخێوکەرەکانیانەوە) ناونیشانی توێژینەوەیەکە توێژەر دەیەوێت ئەنجامی بدات بۆ ئەمەش داوا لەبەڕێزتان دەکات کەسەیری ئەم دەستەواژانەی خوارەوە بکەن کەتوێژەر لە(دراسة استطلاعية) وە دەری هێناوە کەئەنجامدراوە لەسەر کۆمەڵێك(ژمارەیەك) لەبەخێوکەرانەی منداڵەکانیان هاتونەتە خانەی منداڵانی سەرجادەی کوڕان وخانەی منداڵانی سەرجادەی کچان هەروەها توێژەر سودی لەچەند سەرچاوەیەکی تریش وەرگرتووەوبۆیە داواکاری توێژەر لەئێوەی بەڕێز ئەوەیە کەسەرنج وتێبینی خۆتان لەسەر هەر یەکە لەو دەستەواژانە دەربڕن کەتاچەند شیاوودروستە بەپێی ئەو شارەزاییەی کەهەتانە لەو بوارەدا.

| ژ | دەستەواژەکان | دروستە | نادروستە | گۆرانکاری نوێ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١- | هەست دەکەیت نەمانی دایکو باوك هۆیـەك | | | |
| ٢- | بێت | | | |
| ٣- | بەهۆی توندوتیژی ماڵەوە | | | |
| ٤- | هەژاری وکەم دەرامەتی | | | |
| ٥- | ترساوە لەو غەڵەڵەتەی کەکردویەتی | | | |
| ٦- | هیچ گرفتیکی نیە | | | |
| ٧ | نەبونی سەرپەرشتی لەناو خێزاندا | | | |
| ٨ | توندوتیژی باوە ژنەکەی | | | |
| ٩- | بونی هاوڕێی خراپ | | | |
| ١٠ | دەستی پیسە(فێری دزی بووە) | | | |
| - | هەڕەشەی کوشتنی لێ کراوە | | | |
| ١١ | داوای شتی کردووە بۆی جێبەجێنەکراوە | | | |
| ١٢ | خۆی لەنیشکردن دزیوەتەوە | | | |
| ١٣ | بۆلای خزم وکەسوکاری ڕۆیشتووە | | | |
| ١٤ | زۆرنازی دراوەتێ | | | |
| ١٥ | غەڵەتیکردووە بۆیە ڕادەکات | | | |
| ١٦ | بەهۆی ناتەواوی ژیریەوە | | | |
| ١٧ | عینادە بەقسەمان ناکات | | | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | نـەبونی هاوسـەنگی لـەنێوان چـینەکانی | | | |
| ١٩ | کۆمەڵدا | | | |
| ٢٠ | بلاْوبونەوەی خراپی لەناو کۆمەڵدا | | | |
| ٢١ | لەقوتابخانە دەرنەچووە | | | |
| ٢٢ | اهمال کراوە لەلایەن دایکو باوکیەوە | | | |
| ٢٣ | تووشی بەربەرەکانی توند بووە | | | |
| ٢٤ | ڕێك نەکەوتنی دایك وباوکی لەماڵەوە·بونی | | | |
| ٢٥ | ئاژاوە لەناو خێزاندا) | | | |
| ٢٦ | تێنەگەیشتن لەمێرمنداڵ وژیانی | | | |
| ٢٧ | تێرنـەکردنی پێداویسـتیەکانی | | | |
| | ژیانیمێرمنداڵ | | | |
| | خۆی لەمەکتەب دزیوەتەوە | | | |
| | بەرگەنـەگرتنی ئـەو بەرپرسـیارێتیەی | | | |
| | لەخێز | | | |

## پاشکۆی ژمارە(٥)

**بەخێوکەری بەرێز:**

**ئەم کاتەت باش:**

**(هۆکارەکانی ڕاکردنی مێرمندالآن لە خێزانەوە بۆ سەرجادە لە دیدی بە خێوکەرەکانیانەوە )ناونیشانی توێژینەوەیەکە توێژەر ئەنجامی دەدات بۆیە داوا لە بەرێزتان دەکەین هاوکاریمان بکەن ئەویش بەوەلآم دانەوەی ئەم دەستەواژانەیخوارەوەوبۆ نمونە ئەگەر ویستت وەلآمی دەستەواژەی یەکەم(هەست دەکەیت ئەمانی (دایك، باوك) هۆکارێك بێت)بدەیتەوە ئەوا هێمای( ) لەژێر ئەو ستونەی دەگونجێ لەگەڵتا دابنێ هەروەها بەهەمان شێوە بۆ دەستەواژەکانی تریش.**

**مێرمندال/**

**ڕەگەز/**

| نەخێر | تا ئاستێك | بەڵێ | دەستەواژەکان | ژ |
|---|---|---|---|---|
| صفر | ١ | ٢ | هەست دەکەیت نەمانی دایك وباوك هۆکارێك | ١- |
| | | | بێت . | ٢- |
| | | | بەهۆی توبدوتیژی خێزانەوە. | ٣- |
| | | | هەژاری وکەم دەرامەتی. | ٤- |
| | | | ترسان لەسزای ئەو هەڵەیەی کەکردویەتی. | |
| | | | هیچ گرفتێکی نیە . | ٥- |
| | | | نەبونی سەرپەرشتی لوناو خێزان دا. | ٦- |
| | | | بونی هاوڕێی خراپ. | ٧ |
| | | | دەستی پیسە(فێریدزی بووە). | ٨ |
| | | | داوای شتی کردووە بۆی جێبەجێنەکراوە.. | ٩- |
| | | | خۆی لەنیشکردن دزیوەتەوە. | ١٠ |
| | | | نازی زۆری دراوەتێ. | ١١ |
| | | | عینادە بەقسەیکەس ناکات. | ١٢ |
| | | | بەهۆی ناتەواوی ژیریەوە. | ١٣ |
| | | | بەهۆی جیاوازی چینایەتیەوە. | ١٤ |
| | | | بڵاوبونەوەی خراپی لەناو کۆمەڵدا. | ١٥ |
| | | | سەرکەوتو نەبوولەقوتابخانەدا. | |
| | | | توشی بەربەرەکانی دەرونی بووە. | ١٦ |

١٧ فەراموش کراوە لەلایەن خێزانەوە.

١٨ بونی ئاژاوە لەناو خێزاندا.

١٩ تێنەگەیشتن لەمێرمندال و قوناغەکانی ژیانی.

٢٠ تێرنەکردنی حەزو ئارەزووەکانی مێرمندال.

٢١ خوی لەقوتابخانە دزیوەتەوە.

٢٢ قورس کردنی باری سەرشانی مێردمندال بە ئیش کردن.

٢٣ بە هوی هەلوەشاندنی خێزانەوە.

٢٤ نەبوونی شارەزایی دایك لە پەروەردەی دروستی

٢٥ مێردمندال.

٢٦ جیاوازی کراوە لەگەل ئەندامەکانی وتری خێزانەکەی.